هەرێمی کوردستانی عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# زمان و ئەدەبی کوردی

بۆ

پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی

دانانی

لیژنەیەك لە وازەرەتی پەروەردە

بژارکردن و پێداچوونەوەو دارشتنەوەی هەردوو بەشی رێزمان و ئەدەب

یاسین عوسمان حەسەن　　　شێرکۆ ئەحمەد حەوێز

وارتکیس مۆسیس سەرکیسیان　　محەمەد ئەحمەد محەمەد　　ئەڵمان ئەحمەد سەلیم

چاپی چوارەم　　٢٧١٠ کوردی　　٢٠١٠ز

چاپخانەی المستقبل — لوبنان

# پێشەکی:

وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان، بە مەبەستی بژارکردنو پێداچوونەوەی پەرتووکی زمانو ئەدەبی کوردی پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی، لێژنەیەکی دانا، لێژنەکە دەست بەکاربوو، دەستکاری هەردوو بەشی ڕێزمانو ئەدەبی کرد، بەتایبەتیش بەشی ڕێزمانەکە، کە ڕستەو نموونەی زۆری لە هەردوو زاری سەرەکی زمانی کوردی بەکارهێناوە، زۆربەی ڕاهێنانەکانی گۆڕیوە، هەوڵی داوە ڕێزمانی هەردوو زار وەکو زمانێکی یەکگرتوو بخاتە بەردەست، لەبەر ئەوە ئەرکی گەورەی سەرشانی مامۆستایانی بەڕێز ئەوەیە کە خۆیان ماندوو بکەنو بەشێوازێکی تازە بابەتەکان بخەنە ڕوو، بۆ ئەوەی قوتابیان سوودیان لێوەربگرنو شارەزای هەموو لایەنێکی ڕێزمانی زمانەکەیان ببن.

لەبەشی ئەدەبیشدا گۆڕانکارییەك بەسەر مێژووی ژیانی شاعیرانو نووسەراندا هاتووە، هەوڵدراوە لایەنە گرنگەکانی ئەو ژیانە بە جۆرێکی وا بخرێتە ڕوو، هۆکارە کارتێکردووە گرنگەکانی پیشان بدرێن، هەروەها پارچە شیعری هەندێکیانمان گۆڕیوە بە هی تازە.

بەشی خوێندنەوە هیچ دەستکارییەکی ئەوتۆی تێدا نەکراوە، ئەوەندە نەبێ هەندێ بابەت لابراونو هەندێکی تازەش هاتۆتە ناو.

دوا جار داوا لە مامۆستایانی بەڕێز دەکەین کە ئاگادارمان بکەنەوە بەهۆی بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی پارێزگاکانیان لە هەر کەمو کورتیو ناتەواوییەك کە لەکاتی وانە گۆتنەوەیاندا هەستی پێدەکەن، بۆ ئەوەی بتوانین لە چاپەکانی داهاتوودا چاکیان بکەینەوە.

خوا پەناو پشتی هەمووان بێ...

**لێژنەی بژارکردنو پێداچوونەوە**

# بەشی ڕێزمان

# ناو لەڕووی ڕەگەزەوە

ماموستای وانەی جوگرافیا لە باسی (سامانی ئاژەڵ)دا گوتی:

(( سامانی ئاژەڵ، هاوشان دگەل سامانی کشتوکاڵ و چاندن، بەردی بناخەی ئابووری وڵات پێك دەهێنن، لە کوردستاندا، دوو جۆرە سامانی ئاژەڵ هەیە، یەکیان ئەو ئاژەڵانەن کە مرۆڤ بەخودانیان دەکات و سوودیان لێوەردەگرێ، ئەوی دیکەیان ئەو ئاژەڵانەن کە لەدەشت ودەرو شاخ و چیا دەژین و مرۆڤ خودانێ وان نییە، ئەوژی دبێژنێ ئاژەڵی کێوی ئانکۆ (کیڤی).

مەڕ، بزن، میهـ، پەز، توشتیر، بەلەندیر، گیسك، کاڤر، بەرخەنێرو بەرخەمێ، گا، مانگا، چێڵ، هەسپ، ماین، هێسترو هەروەها پەلەوەری وەك مریشك و کەڵەشێرو مراوی و قازو گەلێکی دیکە جۆری یەکەم دەگرێتەوە. شڤان و گاوان بەشێك لەو ئاژەڵانە بە خودان دەکەن. مام پیرۆت شڤان و خاڵ سیامەند ژی گاوانێ گوندێ مەنە. نازدارا دایکا پوشۆی بێریڤان و شیر دۆشە.

جۆری دووەم، ئاژەڵی کێوییە وەك: بزنە کێوی، ئاسك و مامز، هرچ، ڕێوی، گورگ، یەکانەو مالۆس، پەزکیڤی، کەو، پۆڕو قەتێ و سوسکەو گەلێکی دیکە، پێویستە بایەخ بە سامانی ئاژەڵ بدرێ، چونکە گەشەکردنی ئەو سامانە مایەی بەرەو پێش چوونی باری ئابووری وڵاتە)).

## خستنەڕوو:

ئەو نووسینەی سەرەوە، ژمارەیەك ناوی تێدایە کە ئەگەر لێیان وردبینەوە، دەبینین لە ڕووی ڕەگەزو زایەندەوە جیاوازییان هەیە.

کۆمەڵێك لەو ناوانە تەنیا بۆ ڕەگەزی نێر بەکاردێن‌و نکارین بە هیچ جۆرێك بۆ ڕەگەزی دیکە بەکاریان بهێنین وەك ناوەکانی (گا، بەران، یەکانە، هەسپ، کەلەشێر، پیرۆت، سیامەند، شڤان، گاوان، باب، خال... هتد). ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێ (ناوی نێر).

کۆمەڵێکی دیکەی ئەو ناوانە هەر بۆ ڕەگەزی مێ دهێنە بەکارهێنان‌و تایبەتن بەو ڕەگەزە وەك: (مەڕ، توشتیر (چوشتیر)، بەلەندیر (بەردیل)، مالۆس، مانگا، چێڵ، بزن، نازدار، دایك، بێریڤان، مریشك ) ئەو جۆرە ناوانە پێیان دەگوترێ. (ناوی مێ).

هەر لەو نووسینەدا هەندێ ناومان بەرچاو دەکەوێ کە لەیەك کاتدا دەتوانین بۆ نێرو مێ بەکاریان بهێنن، واتە ئەو ناوانە خودانی دوو ڕەگەزن بویێ پێیان دەگوترێ ناوی دوو لایەن وەك (مرۆڤ — مراوی— بەرخ— کاوڕ (کاڤڕ)— ئاسك (مامز)— هرچ— ڕێوی— گیسك— هێستر— کەو... هتد).

کۆمەڵێکی تری ناومان بەرچاو دەکەوێ کە بەر هیچ یەك لەو ناوانەی پێشوو ناکەون‌و ڕەگەزیان نییە، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێ (ناوی بێ لایەن) وەك (بەرد— دەشت— شاخ— چیا— وڵات )و زۆری دیکە. ئەمە لە شێوەی کرمانجی خواروو، بەڵام لە زاری کرمانجی ژووروودا ئەو ناوانەش وە بەر ناوی نێر یان مێ دەکەون.

زۆرجار دەتوانین هەندێك لەو ناوە دوو لایەنانە بەهۆی بەکارهێنانی پەیڤێك لەگەڵیاندا بکەین بە نێر یان مێ. ئەو پەیڤانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێن بریتین لە (نێر– مێ– ما– دێڵ– گۆڵ– کەل ) وەك:

| ناوی دوو لایەن | بۆ نێر | بۆ مێ |
|---|---|---|
| کەو | نێرە کەو | ماکەو، مێ کەو |
| ورچ (هرچ) | نێرە ورچ | دێڵە ورچ، (دەڵە ورچ)، هرچامێ |
| سەگ | گۆڵە سەگ | دێلە، (دەڵە) سەگ |
| گیسك | گیسکی نێر | گیسکامێ، گیسکە مێ |
| پڵنگ | پڵنگی نێر | پڵنگا مێ، پڵنگی مێ |

## دەستوور:

**ناو لە لایەنی ڕەگەزەوە دەکرێ بە چوار جۆر:**

**١. ناوی نێر: ئەو ناوەیە کە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ڕەگەزی نێر بەکار هاتبێت، ئەو جۆرە ناوە بەسەر ئەم کۆمەڵانە دادەبڕێت:**

**ئـ ناوی کەسانی نێرینە وەك: پیاو- کوڕ- مام- خاڵ- باوك- برا- پسمام**

**بـ ناوی تایبەت بە کوڕان وەك: شێرکۆ، لەزگین، پیرۆت، سیامەند.**

**پـ ناوی گیانداری نێر وەك: هەسپ- کەڵەشێر- یەکانە- نێری- بەران.**

**تـ ناوی هەندێ پیشەی پیاوانە وەك: نانەوا، شڤان، گاوان، خزمەتکار**

**٢. ناوی مێ: ئەو ناوەیە کە هەر لە بنەڕەتدا بۆ ڕەگەزی مێ بەکارهاتبێت، ئەویش بەسەر ئەم کۆمەڵە وشەو پەیڤانە دابڕاوە:**

ئـ ناوی کەسانی مێیینە وەك: دایـك- خوشـك- کـچ- دۆتمـام- خەسـوو- بووك.

ب- ناوی تایبەتی کچان وەك: نازدار- شیرین- هێرۆ- پەروین.

پ- ناوی گیانداری مێ وەك: ماین- بەلەندیر- مالۆس.

ت- ناوی هەندێ پیشەی ژنانـه وەك: نانکـەر- بێریڤـان- تەشـی ڕێـس- مامان (داپیرك)- دایەن- بەربووك.

٣. ناوی دوو لایەن: ئەو ناوانەن کـه بـۆ نێـرو بـۆ مـێ بـەکاردێن وەك: قوتابی- مامۆستا- مرۆڤ – کۆتر- کەو.

بەشێك لەو ناوە دوولایەنانە دەتـوانین بـەهۆی پەیڤـەکانی (نێـر - مێ - ما - دێڵ - گۆڵ ) بکەین بە ڕەگەز نێر یا مێ.

٤. ناوی بێ لایەن: ئەو ناوانەن کە سەر بە هیچ کـام لـەو دوو ڕەگـەزە نین و هەر لەبنەڕەتدا ڕەگەزییان نییە. وەك: (شاخ، چیا، بەرد، دار، هەنار)، هەر چەندە لە زاری کوردی کرمانجی ژووروودا ئەم جۆرەش لە خستنە پاڵدا (ئیزافە)وە بەر یەك لە دوو ڕەگەزی نێر یـان مـێ دەکەوێ.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ناوانەی لای خوارەوە نێرو مێیان لێك جودا بکەوەو بەرامبەر یەکیان بنووسە:

(ئەسپ – مریشك - نێری - چێڵ - برا – ماین - ئێکانە- خوشك – مالۆس - کەڵەشێر - بزن - گا ).

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوانە دوو لایەنن، بەهۆی پەیڤێکەوە ڕەگەزیان بۆ دیاری بکە (نێر یا مێ ):

کەو– سەگ – هرچ – ڕویڤی

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێڕە هۆنراوەو ڕستانەدا هەر ناوێك هەیە دەریاین بهێنەو ڕەگەزەکانیان نیشان بدە:

١. کچی کورد ئەی گوڵی نەورۆز ئەرێ کام دەست لە باخی ژین
لە بۆ یەك دەفعە بۆن کردن بە ناکامی ئەتۆی هێنا
(دڵدار)

٢. مەڕ لە گۆشت بووە سوور
خۆ هەڵداوێن شەك‌و کوور
گەماڵ دەکەن چەق‌و لوور
سەوەڕیان دەچێ بۆ دوور. (هێمن)

٣. دلبەریٚ دارا شرینیٚ

ژارویێ مالو دلۆ

کەفتینە دەردیٚ ئەڤینیٚ

ئای دلّی من ئای دلۆ.

(شێخ مەمدوح بریفکانی)

٤. مانگای مالّی پوورە خەجیٚ زا.

# نیشانە تایبەتییەکانی نێرو مێ

رستەکان:

١. بابێ ئازادی ئەندازیارە.

٢. خوشکا سەرداری چوو خوێندگەهێ.

٣. خانییێ من گەلەك مەزن و تازەیە.

٤. زەڤیيا بەرمالا بەراڤە.

٥. دۆستێ تە هات ژ دهۆکێ.

٦. دۆستا من گەلەك ڕندو جوانە.

٧. کوڕۆ، بخوێنن دا سەرکەڤن.

٨. شرینێ، چێلێ بدۆشە.

٩. کوڕە، ئەم کارە مەکە.

کچێ، وانەکانت چاك بخوێنە.

١٠. کوڕینە (کچینە) ئەم کارە مەکەن.

١١. ڤی قەلەمی بۆمن بکڕە.

ڤێ دەفتەرێ بۆمن بهینە

وی کوڕی کەوەك گرت.

وێ کچێ کراسەك دووری.

١٢. سەرداری شیڤ خار

نازدارێ تەشی رێست

## خستنه ڕوو:

ئەگەر سەرنج لەو ڕستانە بدەین، دەیبینین هەندێ لە ناوەکان نیشانەی وایان پێوەیە کە دەتوانین بەهۆیانەوە ڕەگەزو جنسی ناوەکە بزانین:

١. لە ڕستەی یەکەمدا نیشانەی (ێ) خراوەتە سەر ناوی (باب) لە دۆخی دانە پاڵدا (ئیزافەدا) چونکە ڕەگەزی باب نێرەو لەو دۆخەدا (ێ)ی دەخرێتە سەر.

٢. کەچی دەبینین لە ڕستەی دووەمدا نیشانەی (ا) خراوەتە سەر پەیڤی (خوشك) چونکە ڕەگەزی پەیڤەکە (مێ)یەو لەو دۆخەدا نیشانەی (ا)ی دەخرێتە سەر.

٣. هەروەها لە ڕستەی سێیەمدا، پەیڤی (خانی) واتە (خانوو) چونکە لە ڕەگەزدا نێرە (لە زاری کرمانجی ژووروودا) بۆیێ لە دۆخی دانە پاڵدا (ێ)ی وەرگرتووەو بووە بە (خانیێ من).

٤. کەچی لە ڕستەی چوارەمدا چونکە پەیڤی ( زەڤی- زەوی) لە ڕەگەزدا مێیە، بۆیە لە دۆخی دانە پاڵدا (ا)ی پێوە نووساوەو بووە بە (زەڤییا بەر مالا ) واتە زەوی بەرماڵان.

٥. ئەگەر سەرنج لە ڕستەی پێنجەم بدەین دەبینین وشەی (دۆست) دوو لایەنە، واتە بۆ نێرو مێ بەکاردێ، بەڵام بۆ دەست نیشان کردنی ڕەگەزەکەی، لە دۆخی دانە پاڵدا بۆ نێر (ێ)ی دەخرێتە سەرو دەبێتە (دۆستێ سەرداری) واتە ڕەگەزی دۆستەکە نێرە، بۆ

(مێ) نیشانەی (ا)ی دەخرێتە سەرو دەبێتە (دۆستا من) واتە ڕەگەزی دۆستەکەی من مێیە.

٦. لە ڕستەی حەفتەمدا نیشانەی (ۆ) خراوەتە سەر پەیڤی (کوڕ) لە دۆخی بانگکردندا، چونکە ڕەگەزی کوڕ نێرە.

٧. کەچی لە ڕستەی هەشتەمدا چونکە ڕەگەزی (کچ) مێیە، لەبەر ئەوە لە دۆخی بانگکردندا نیشانەی (ێ)ی دەخرێتە سەر.

٨. لە ڕستەی نۆیەمدا هەر پەیڤی (کوڕ) لە دۆخی بانگکردندا نیشانەی (ە)ی خراوەتە سەرو بووە بە (کوڕە)و وشەی کچیش هەر لەو دۆخەدا (ێ)ی پێوە نووساوەو بووە بە (کچێ). ئەم دوو نیشانەیە لە زاری کرمانجی خوارووددا بەکاردێن. کە ناوە بانگکراوەکە (کۆ) بوو، نیشانەکە بۆ هەردوو ڕەگەز دەبێتە (ینە) وەکو:

٩. ڕستەی دەیەم (کوڕینە- کچینە- ئەم کارە مەکەن).

١٠. لە ڕستەکانی ژمارە (یازدە)دا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤی- ی) بەکارهاتووە بۆ تاکی ڕەگەز نێری نزیك، لە ڕستەی (ڤی قەلەمی بۆمن بکڕە)، ئینجا (ڤێ- ێ) بەکار هاتووە بۆ تاکی ڕەگەز مێی نزیك لە ڕستەی (ڤێ دەفتەرێ بۆ من بهینە) چونکە ڕەگەزی (دەفتەر) مێیە.

١١. بۆ تاکی ڕەگەز نێری دووریش هاوەڵناوی نیشانەی (وی- ی) لە ڕستەی (وی کوڕی کەوەك گرت) بەکارهاتووە هاوەڵناوی

(ویٚ– یٚ) بۆ تاکی ڕەگەز مێی دوور، لە ڕستەی (ویٚ کچیٚ کراسەك دووری) بەکارهاتووە.

١٢.لە ڕستەی (سەرداری شیف خار)دا، چونکە کاری ڕستەکە ڕابوردووی تێپەڕە، بۆیێ نیشانەی (ی) خراوەتە سەر ناوە ڕەگەز نێرەکەو نیشانەی (یٚ) لە ڕستەی (نازداریٚ تەشی ڕێست)دا خراوەتە سەر ناوە ڕەگەز مێیەکە، کە لەو ڕستەیەشدا کاری (ڕێست) ڕابوردووی تێپەڕە، دەبێ ئەوەش بزانین کە ناوی (کۆ) نیشانەی نێرو مێ وەرناگرێت.

## دەستوور:

**لەزاری کوردی کرمانجی ژووروودا، چەند نیشانەیەك هەن دەخرێنە سەر ناو، بۆ جوداکردنەوەی ناوی نێرو ناوی مێ.**

**نیشانەکان بەم جۆرە بەکاردێن:**

**١. لە دۆخی دانە پاڵ یان ئیزافەدا:**

**ئـ نیشانەی (یٚ- ییٚ) بۆ نێر بەکاردیٚ وەك (براییٚ من)، (هەڤاڵیٚ تە).**

**بـ نیشانەی (ا – یا ) بۆ میٚ بەکاردیٚ وەك (کچا سەربەستی).**

**٢. لە دۆخی بانگکردندا بۆ نێر نیشانەی (ۆ) بەکاردیٚ وەك: کوڕۆ- بابۆ. بۆ (میٚ) نیشانەی (یٚ) بەکاردیٚ وەك: کچیٚ، دەلالیٚ. لە شێوە زاری کوردی کرمانجی خوارووشدا نیشانەی (ە) بۆ نێر بەکاردیٚ وەك (کوڕە)، نیشانەی (یٚ) بۆ میٚ بەکاردیٚ وەك (کچیٚ). بۆ ناوی کۆی نێرو میٚ (ینە) بەکاردیٚ وەك کوڕینە، کچینە.**

**٣. جێناوی نیشانە بۆ نێرو مێ لە زاری کرمانجی ژووروودا بەم جۆرەیە:**

**ئـ (ڤی) بۆ تاکی نێری نزیك.**

**ب- (ڤێ) بۆ تاکی مێی نزیك.**

**پ- (وی) بۆ تاکی نێری دوور.**

**ت- (وێ) بۆ تاکی مێی دوور.**

ئەم دوو جێناوە بۆ کەسی سێیەمی تاکیش بەکاردێن

**٤. (ڤان) بۆ کۆی نزیکی نێرو مێو (وان) بۆ کۆی دووری نێرو مێ بەکاردێن.**

**٥. ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابووردووی تێپەڕ بوو:**

**(ی) بۆ نێرو (ێ) بۆ مێ بەکاردێن وەك:**

**ئـ. بۆ نێر : لەزگینی دەرس نڤیسی.**

**ب. بۆ مێ : شرینێ پەز دۆشی.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ناوانە لە دۆخی دانە پاڵدا (خستنەسەر)دا لە ڕستە بەکاربهێنە، پاشان ڕەگەزەکانیان بنووسە:

ئاڤ - ڕەز - چاڤ - ڕووبار - ماڵ.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوانە لە دۆخی بانگکردندا لە ڕستە بەکاربهێنە:

لاوان - ژن – کیژ – قوتابییان - خاڵ.

## ڕاهێنانی (٣)

١. لە دۆخی دانە پاڵدا (خستنەسەردا) ناوی ڕەگەز مێ چ نیشانەیەك وەردەگرێ؟

٢. لە دۆخی دانە پاڵدا (خستنەسەردا) ناوی ڕەگەز نێر چ نیشانەیەك وەردەگرێ؟

٣. لە دۆخی بانگکردندا ئەگەر ناوەکە تاکی نێر بوو، لە زاری کرمانجی ژووروودا کام نیشانە وەردەگرێو لە کرمانجی خواروشدا کامە؟

٤. جێناوی نیشانەی (ڤان) بۆچیو (وان) بۆچی بەکاردێن؟

## ڕاهێنانی (٤)

جێناوی نیشانەی تاکی نزیكو دوور بدە پاڵ ئەو ناوانە لە ڕستەدا، ئەوجا ڕەگەزی ناوەکان بنووسە:

دەرگە – کچ – جامێر – ماهین - گوند.

## ڕاهێنانی (٥)

١. لە دانەپاڵدا (خستنەسەر) دا نیشانەی نێرو مێ چین؟ نموونەی ڕستەییان بۆ بهێنەوە.

٢. لەڕستەی کار ڕابوردووی تێپەڕدا نیشانەکانی نێرو مێ کامانەن، نموونەی ڕستەییان بۆ بهێنەوە.

٣. جێناوی نیشانە بۆ تاکی مێی نزیك چییە؟ نموونەی ڕستەیی بۆ بهێنەوە.

٤. جێناوی نیشانەی تاکی نێری دوور چییە؟ نموونەی ڕستەیی بۆ بهێنەوە.

## ڕاهێنانی (٦)

### شلۆڤەکردن:

برایێ ئازادی هات.

برا : ناوە، تاکە، گشتییە، بکەرە، نەناسراوە.

یێ : نیشانەی ڕەگەزی نێری تاکە لە دانە پاڵدا (خستنەسەردا).

ئازاد: ناوە، تاکە، تایبەتییە، تەواوکەری ناوی برایە.

ی: نیشانەی نێری تاکە.

هات: کاری ڕابوردووی تێنەپەڕی سادەیە.

ئەم ڕستانە شی بکەوە:

١. ڤێ کچێ نان خوار.

٢. کچینە بخوێنن.

# ناوی نەناسراو - ناوی ناسراو

## ئـ- ناوی تاکی نەناسراو

١. کچێك (کچەك، کچیٚ) دەرگای ماڵی ئێمەی کردەوەو هاتە ژوورەوە.
کچەکیٚ دەرگەهیٚ مالامە ڤەکرو هات ژوورڤە.

٢. کـە چـاوم پێـت کـەوت تووشـی دەریاێـك (دەریایـەك، دەریـاییٚ)
خەفەتو پەژارە بووم.
چووینە دیٚ یێك (دێیەك، دێییٚ) لەبناری چیای قەندیل.
کانییێکی (کانییەکی، کانییٚ) خۆش لە گوندەکەمان هەیە.
هەڵۆیێك (هەڵۆیەك، هەڵۆیی) لە ئاسماندا نێچیرێکی گرتبوو.
پەنجەرەێك (پەنجەرەیەك، پەنجەرەییٚ) لە ژووری سەرەوە شکابوو.

٣. دار بەڕووێك (دار بەڕووەك، داربەڕوویٚ) لەو دارستانە وشك بووە.

٤. ڕۆژانێك (ڕۆژانەك، ڕۆژانیٚ) مرۆڤ لە ئەشکەوتان دەژیا.

### خستنە ڕوو:

ئەگـەر ڕسـتـەکانی لای سـەرەوە بـە وردی بخەینـە بـەر سـەرنج دان ئەوەمان بۆ دەردەکەویٚ کە:

١. لەڕستەی یەکەمدا کـە نـاوی (کـچێك– کـچەك– کـچیٚ) دەهـێـنین، مەبەستمان تاکە کچێکەو ئەو کچەش نە ناسراوەو تاکیشە.

٢. له ڕستەی دووەمدا کە دەبێژین (دەریایێک، دەریایەک، دەریایێ) مەبەست ئەوەیە، دەریایەکە هەم تاکە هەم نەناسراویشە واتا هەردوو نیشانەی یا هەردوو سیفەتی تاکایەتیو نەناسراویی پێوەیە.

٣. هەر بەم جۆرە لە ڕستەکانی دی کۆمەڵە ناوێك دەبینین کە بەڕیز بریتین لە:

دێییێك، دێییێك، کانییێ

هەڵۆییێك، هەڵۆیەك، هەڵۆییێ

پەنجەرەییێك، پەنجەرەیەك، پەنجەرەییێ

ئەم ناوانە وەکو ئەوانی پێشوو هەموویان هەم تاکایەتیو هەم نەناسراویی پیشان دەدەن، ئەو پیشان دانەش بەهۆی ئامرازێك کراوە کە بریتییە لە (ێك، ەك، ێ).

٤. لە ڕستەی ژمارە (٣)شدا، ناوی داربەڕوو، بووە بە (داربەڕووێك، داربەڕووەك، دار بەڕووێ) کە هەر هەمان مەبەستی نە ناسراویی وتاکایەتی دەبەخشێ.

٥. لە ڕستەی ژمارە (٥) داناوی (ڕۆژانێك، ڕۆژانەك، ڕۆژانێ) ناوێکە نەناسراویی پیشان دەدا بەڵام تاك نییە، بەڵکو بەهۆی نیشانەی (ان) کۆکراوەتەوەو نیشانەکە خراوەتە دوای ناوەکە پێش نیشانەی (ێك) کە بۆ نەناسراوی بە کارهاتووە، کەواتە ئەم نیشانەیە دەخرێتە سەر ناوی کۆ هەروەکو چۆن لەگەڵ تاکیشدا بەکاردێ.

## دەستوور:

١. نیشانەی نەناسیاویی لە زمانی کوردیدا، جگە لە نیشاندانی نەناسیاویی تاکایەتیش نیشان دەدا، هەرچەندە جاروبار دەخرێتە سەر ناوی (کۆ)ش.

٢. نیشانەکە یەك لەم شێوانە وەردەگرێ:

(ێك، ەك، ێ)، کە دەخرێتە سەر ناوو دەیکا بە ناوی نەناسراو بەم جۆرە:

ئـ- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە پیتی نەبزوێن، یەکسەر نیشانەی (ێك، ەك، ێ) دەخرێتە سەر ناوەکە وەك:

پیاو- پیاوێك، پیاوەك، پیاوێ

دار = دارێك، دارەك، دارێ

ب- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنەکانی (ا، ێ، ی، ۆ، ە) لە نێوان ناوەکەو نیشانەکە نەبزوێنی (ی) پەیدا دەبێ وەك:

چیا + ی+ نیشانەکە= چیاییێك، چیایەك، چیاییێ

زێ + ی+ نیشانەکە= زێ ییێك، زێیەك، زێیێ

ماسی+ ی+ نیشانەکە= ماسی ییێك، ماسی یەك، ماسی یێ

پەڕۆ+ ی + نیشانەکە = پەڕۆییێك، پەڕۆیەك، پەڕۆییێ

پەڕە+ ی + نیشانەکە = پەڕەییێك، پەڕەیەك، پەڕەییێ

پ- ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنی (وو)، نەبزوێنی (و) لەنێوان ناوەکەو نیشانەکە دادەنرێ، بزوێنی (وو) ئەو کاتە لە دەربڕیندا کورتتر خۆی نیشان دەدا. وەك:

بەڕوو + و + نیشانەکە= بەڕوویێك، بەڕووەك، بەڕوویێ[1].

٣. ناوی نەناسراو (ان)ی نیشانەی کۆکردنەوەی ناو وەردەگرێتو ئەو نیشانەیە دەکەوێتە نێوان ناوەکەو نیشانەی نەناسییەوە. وەك:
کەس+ ان+ نیشانەکە= کەسانێك، کەسانەك، کەسانێ.

٤. جاری وا دەبێ نیشانەی نەناسیاوی دەخرێتە سەر هاوەڵناوەوە، وەك: لە ڕستەی (جوانێك هاتە ژوورەوە) کە لێرەدا پەیڤی (جوان) هاوەڵناوەو نیشانەکەی پێوە لکاوە.

## ب- ناوی ناسراو

((دارەکە زۆر بڵند بوو، کەس ژمە نەشیاین بچینە سەری، باخەوانەکە خۆی هەنارە شیرینەکەی بۆمە لێ کردەوە، هەروەها لە دار هەرمێکە (دار هەرمێیەکە)و لە هەڵووژەکە هەندێکی بۆ لێ کردینەوە.

میوانەکانمان بردو چووینە سەر کانییەکە، لۆیرێ ڕوونیشتین و دەستمان کرد بە میوە خواردن، ئاوی کانییەکە گەلێك سارد بوو، تەنانەت بادییە دۆکەی (دۆیەکەی) کە لەناو ئاوەکە دانرابوو ساردو تەزی ببوو.

جوتیاری برای باخەوانەکە لەژێر داربەڕووەکەدا پاڵ کەوتبوو بەرامبەر چیاکە (چیایەکە)و تەماشای ئێمەی دەکردو خۆزی ئەوەی دەخواست کەلەو ڕوونیشتنە لەگەڵمان بوایە، لە پڕ مارێکمان لێ دەرکەوت، ویستمان بیکوژین، مارە بۆی دەرچوو، لەدەستمان ڕزگاری بوو)).

---

(١) دەبوایە بەسێ واو بنووسری، بەڵام چونکە نووسینی سێ واو پێکەوە کرێتەو پەسند نییە، بۆییێ واوێك لە نووسیندا چاوپۆشی لێ دەکری.

## خستنه ڕوو:

له خوێندنهوهی ئهو دهقه نووسینهی سهرهوه، دهبینین ژمارهیهك ناو هێلیان به ژێردا كێشراوه، ئهو ناوانه بۆیێ هێلیان بهژێردا هاتووه، چونكه ههر یهكهیان نیشانهیهكی تایبهتی خراوهته سهر بۆ ئهوهی مهبهستێك دهربڕێ.

بۆ نموونه ئهگهر تهماشای ناوهكانی:

(دارهكه، باخهوانهكه) بكهین له بنهڕهتدا ئهم دوو ناوه لهشێوهی (دار، باخهوان)دا بوون، كه ههردووكیان كۆتاییان هاتووه به پیته نهبزوێن، ئێمهش هاتووینو نیشانهی (هكه)مان خستوهته سهریان بۆ ئهوهی بیانكهین به (دارهكه، باخهوانهكه).

دیاره جیاوازی لهنێوان (دار، دارهكه)و (باخهوان، باخهوانهكه)دا ههیه، لهوهدا كه (دار) ناوێكی گشتییهو بهسهر ههموو جۆره دارێكدا دابڕاوهو جۆره دارێكی دیارو ئاشكراو ناسراو دهست نیشان ناكا، بهڵام (دارهكه)، دارێك دهست نیشان دهكا كه لهمهوبهر لامان ئاشكراو دیارو ناسراو بووه، كه گوتمان (دارهكه) یهكسهر بیرو هۆشمان بۆ لای دارێك دهچێت كه لهمهو پێش ناسیومانهو دهزانین كامهیه، بۆیێ نیشانهی (هكه) ناوهكهی بۆ كردین به ناوی ناسراو، ههروا (باخهوان، باخهوانهكه)ش.

ناوی (دار هەرمێكه– دار هەرمێیهكه) كه له بنهڕهتدا (دار ههرمێ) كۆتایی به بزوێنی (ێ) هاتووه، بههۆی نیشانهی (هكه)وه كردوومانه به

ناوێکی ناسراو، بەڵام چونکە ناوەکە هەروەکو گوتمان کۆتایی بە بزوێن هاتووە، بۆیێ (ە)ی سەرەتای نیشانەکە تێدەچێ‌و دەبێتە (هەرمێکە) یانژی پیتی نەبزوێنی (ی‌ y ) دەبێتە ناوبڕو دەکەوێتە نێوان ناوەکەو نیشانەکەوەو دەبێتە (دار هەرمێیکە) هەر بەم جۆرەش ناوەکانی:

بادییە دۆکە یان بادییە دۆیەکە.

چیاکە یان چیایەکە.

هەر یەکەیان بەهۆی نیشانەی (ەکە)وە کراون بەناوی ناسراو، بەڵام چونکە ناوەکان لە بنەڕتدا کۆتاییان بە بزوێن هاتووە، بۆیێ (ە)ی سەرەتای نیشانەی (ەکە)، یان تێدەچێ یانژی (ی)ی نەبزوێن وەکو ناوبڕ دەکەوێتە نێوان ناوەکەو نیشانەکەوە.

هەر ناوێکیش کە کۆتایی بە بزوێنی (ی) هاتبێ وەکو (کانی)، کە دەکرێ بە ناسراوو نیشانەی (ەکە)ی دەخرێتە سەر، نەبزوێنی (ی) پێویستە ببێ بە ناوبڕو لە نێوان پیتی (ی) کۆتایی ناوەکە، کە بزوێنەو، پیتی (ە)ی نیشانەکە دابنرێ وەکو:

کانی دەبێتە (کانییەکە).

ماسی دەبێتە ( ماسییەکە).

ناوی (هەڵووژەکە) کە لە بنەڕەتدا بریتییە لە (هەڵووژە) کۆتایی بە بزوێنی (ە) هاتووە، کە دەیکەین بە ناوێکی ناسراو بە هۆی نیشانەی (ەکە)، ئەوا یەکێك لە دوو بزوێنی (ە) تێدەچێ.

هەروەها ناوی (داربەڕووەکە)، ئەم ناوە لە بنەڕەتدا کۆتایی بە بزوێنی (وو) دێت، کاتێ کە نیشانەی (ەکە)ی ناسیاویی دەخرێتە سەر،

ئەوا پیتی نەبزوێنی (و – W ) لەنێوان ناوەکەو نیشانەکەدا پەیدا دەبێ‌و بزوێنی (وو) لەکاتی دەربڕیندا کەمێك لەباری ئاسایی خۆی کورتتر دێتە گۆتن.

هەر لە دەقەکەدا ڕستەیەك بەم جۆرە هاتووە (لە پڕ مارێکمان لێ دەرکەوت، ویستمان بیکوژین، مارە بۆی دەرچوو).

لەو ڕستەیەدا ناوی (مارە) ناوێکی ناسراوەو بەهۆی نیشانەی (ە)، کە ئەویش نیشانەی ناسیاوی ناوە، کراوە بەناوی ناسراو، لەوانەشە ئەم نیشانەیە کورتکراوەی نیشانەی (ەکە) بێت.

ناوی ناسراو وەنەبێ هەر تاك بێ، بەڵکو هەموو ناوێکی ناسراو بەهۆی نیشانەی (ان)ی کۆ، کۆ دەکرێتەوە، نیشانەکە دەخرێتە دوای (ەکە)و ناوەکە دەبێتە ناسراوی کۆ، وەك لە نووسینەکەدا لە ڕستەی (میوەکانمان بردو چووینە سەرکانییەکە)دا دەردەکەوێ.

زۆرجاری وا دەبێ نیشانەی ناسیاوی دەکەوێتە سەر هاوەڵناوەوە، بەڵام لەو بارەشدا ئەو ناوەی لەگەڵ هاوەڵناوەکەدا دێ، هەر بە ناوێکی ناسراو دادەنرێ وەك لەڕستەی (باخەوانەکە خۆی هەنارە شیرنەکەی بۆمە لێ کردەوە) دا دەردەکەوێ. کە لێرەدا نیشانەی (ەکە)ی ناسیاوی خراوەتە سەر هاوەڵناوی (شیرین) نەك ناوی (هەنار)، بەڵام ناوی هەناریش دەبێتە ناوێکی ناسراو، هەر چەندە نیشانەکە لەسەر هاوەڵناوەکەیە.

## **دەستوور:**

**ناوی ناسراو، ناوێکە کە ماناو مەبەستی شتێك دەردەخاو بە ناسراویی دەیخاتە ڕوو، بە ئاسانی لە هاوچەشنەکانی خۆی جیای دەکاتەوە، چونکە ناوێکی دیاری کراوی زانراو دەردەخات.**

**نیشانەی سەرەکی ناسیاویی (ەکە)[1]، یە بەم جۆرە بەکاردێت.**

1. **ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە نەبزوێن هاتبوو یەکسەر نیشانەکەی دەخرێتە سەر.**
2. **ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنەکانی (ا، ۆ، ێ )، ئەوا یان (ە)ی سەرەتای (ەکە) تێدەچێ، یان لەنێوان ناوەکەو نیشانەکە، نەبزوێنی (ی، y ) وەك ناوبڕ پەیدا دەبێ.**

---

(١) ١. هەموو ناوێکی تایبەتی ناسراوە وەك کەرکووك، ئازاد، پەروین.

٢. هەروەها ناو بەچەند شێوەیەکی تریش دەکرێ بە ناسراو:

ئـ – هەر ناوێك ئەگەر لەگەڵ هاوەڵناوی نیشانەدا هات دەبێتە ناسراو وەك:

ئەم چیایە بڵندە، ئەڤ ڕووبارە درێژە، ئەو شارە خۆشە، وی کوڕی دەرس خاندیە، وێ کچێ دەرس نەخاندیە، ڤی زەلامی کارێ خۆ کریەیە، ڤێ ژنێ تەشی ڕێستییە.

کە دیارە لێرەدا ناوەکانی (چیا، ڕووبار، شار، کوڕ، کچ، زەلام، ژن) هەموویان ناوی ناسراون.

ب– ئەگەر ناوەکە لەباری دانەپاڵ دابوو (ئیزافە) بۆ ناوێکی تایبەتی یان جێناوێکی کەسیی سەربەخۆ ئەوا بەناوی ناسراو دادەنرێ وەکو:

ژنی نەوزاد مامۆستای زانکۆیە، کچا لەزگینی قوتابییە، برای من پێشمەرگەیە، خوشکا مە ل ئامێدیێیە.

پ– هەموو جێناوەکانی نیشانە بە ناسراو دادەنرێن وەکو:

ئەمەم کڕی، ئەوەم فرۆشت، من ئەڤە کڕی، ڤێ شیف چێ کر، ڤێ دار بڕییە، ئەمانەم دیون، ئەوانەشم نەفرۆشتوون؟

٣. ئەگەر ناوەکە کۆتایی هاتبوو بە بزوێنی (ی)، ئەوا لەنێوان ناوەکەو نیشانەکە (ی، y ) نەبزوێن وەك ناوبڕ دادەنرێ.

٤. ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی (وو) هاتبوو، پیتی نەبزوێنی ( و، W ) وەکو ناوبڕ دەخرێتە نێوان ناوەکەو نیشانەکە.,

٥. ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی (ە) هاتبوو، کە دەکرێ بە ناسراو یان (ە)ی بزوێنی کۆتایی ناوەکە یان هی سەرەتای نیشانەکە تێدەچێ.

٦. زۆرجار نیشانەی (ە) بۆ ناسیاوی بەکاردێ کە ڕەنگبێ کورت کردنەوەی (ەکە) بێت وەك کوڕە هات- کچە شووی کرد.

٧. ناوی ناسراو بە نیشانەی (ان) کۆ دەکرێتەوە کە دەخرێنە، دوای نیشانەکەوە.

٨. ئەگەر هاوەڵناوێك بەدوای ناوەکەو هات نیشانەی (ەکە) دەخرێتە سەر هاوەڵناوەکەو ناوەکەشی هەر دەبێ بە ناسراو.

٩. نیشانەی ناسیاویی ناچێتە سەر ناوی تایبەتییەوە.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەدا ناوە نەناسراوەکان بگۆڕە بۆ ناوی ناسراو.

١. ئازاد دەرگایەکی کردەوە.

٢. کتێبێکم بۆ بکڕە.

٣. دوێنێ مامۆستایێك چیرۆکێکی بۆ خوێندکاران خوێندەوە.

٤. پەریزاد سێوێکی خوارد.

٥. نەوزاد وانە دەخوێنێ.

٦. کوڕێکم دیت.

٧. قەلێك سەلکە پەنیرێکی بە دەنووك هەڵگرتبوو.

٨. پار کچێك بە یەکەم دەرچوو.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا ناوەکان لەتاکی نەناسراوەوە بکە بە کۆی ناسراو، هەر گۆڕانکارییەکی دی بەسەر ڕستەکاندا دێن بیانکە.

١. کراسێکی جوانم کـــــــڕی.

٢. برادەرێکم هاتو سەری لێدام.

٣. دێیێك ئاوەدان دەکەنەوە.

٤. کابرایەك ڕەزێکی کێلا.

٥. ڕاوکەرێك کەوێکی گرت.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم هۆنراوانەدا هەر ناوێکی ناسراو یان نەناسراو هەیە، دەریان بهێنە، بیان نووسەو چۆنیەتی بوونیان بە ناسراو یان نەناسراو ڕوون بکەوە:

١. کۆمەڵە شاخێك سەختو گەردن کەش

ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش. (گۆران)

٢. دەورێ دەر ساقی وەلای مەحزووندا

لەیل ئاسا بویەر وەلای مەجنووندا

جامێ جە سەهبای دیای باڵاکەت

ئالوودەی غوبار تۆزی پالاکەت

بەو نازو عیشوە وێت پێم دەرەوە

جەستەی پەژموورده‌م ئیحیا کەرەوە. (مەلەوی)

٣. چاوەکەم دووربێ لەڕووت وا چاوەکانت ژان ئەکەن

هەر لە سورمەی خاکی ڕێگات ئارەزووی دەرمان ئەکەن

یەعنی ئاوی دیدکانی من لە دووری قامەتت

وا بەخوڕ دێن هەر لەنەهری تانجەڕۆو سیروان ئەکەن.

(ئەحمەد موختا جاف)

٤. ڕۆژێکی بەهار دەمەو بەیانی

مێرووله‌یه‌کم دی لەسەر کانی

بەتاقی تەنیا لەو قەراخ ئاوە

چنگی لە پارچە نانێ ئاڵاوە

بۆ ئەوەی بیبا بەرەو شارەکەی

کەچی گران بوو سەنگی بارەکەی. (کاکەی فەللاح)

## ڕاهێنانی (٤)

لەم ڕستانەدا هەر ناوێکی ناسراو هەیە بیکە بە نەناسراوو ڕستەکان بنووسەوە.

١. جانتاکەم دۆزییەوە.

٢. پەپوولەکە لەسەر گوڵەکە نیشتەوە.

٣. چاوم بە پیاوەکە کەوت.

٤. ڕێیەکەمان قیرتاو کرد.

٥. دارستانەکە سووتا.

## ڕاهێنانی (٥)

نموونە:

ئـ- چێڵ ب- چێڵێك پ - چێڵەکە ت- چێڵەکان

ئەم ناوانە وەك (ب، جـ، د ) بنووسە:

چرا، مانگ، ماسی، زانکۆ، ئاگر، شەپۆڵ، پەنجا دیناری

## ڕاهێنانی (٦)

شلۆڤەکردن (شیکردنەوە)

١. بێریڤانەکە مەڕەکانی دۆشی.

٢. فڕۆکەکە بە ئاسماندا دەسوڕێتەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| | | |
|---|---|---|
| کەس ژمە | : | کەس لە ئێمە، کەس لەمە |
| نەشیاین | : | نەمانتوانی. |
| لوێرێ | : | لەوێ، لەوێندەرێ |
| بادی | : | جام، کاسە. |
| لە پڕ | : | لە ناکاو، لە هیکرا، ژنشکەکیڤە. |
| سەلکە پەنیر | : | سەرکە پەنیر. |
| گەردن کەش | : | چیای لووتکە بڵند. |
| باوەش | : | ئامێز. |
| لەیل ئاسا | : | وەکو لەیلا. |
| بویەر | : | وەرە. |
| وەلای | : | بەلای، بەکن، بەنك. |
| سەهبا | : | مەی، شەراب. |
| دیای | : | دیتنی، بینینی. |
| ئالوودەی غوبار | : | تێکەڵ بە تۆزو گەرد. |
| پاڵاکەت | : | کەوشەکەت، پێلاڤێ تە. |
| وێت | : | خۆت. |
| پێم دەرەوە | : | پێم بدەوە. |
| جەستەی پەژموردەم | : | تەنی سیسو ژاکاوم، لەشی زەعیفو لاوازم |
| سورمە | : | کوحل، کل، تۆزێکە ژن لە چاویان دەدەن. |
| دیدەکان | : | چاوەکان. |
| سەنگ | : | قورسایی |

# ناوی تاك‌و ناوی كۆ

((لەسەردەمی ئێستادا كوڕان‌و كچان ڕوو لە قوتابخانان دەكەن، ژنان‌و پیاوان خوێندەوارن، مرۆڤی خوێندەوار پتر خزمەتی وەلات دەكا، جوتیارانی كورد ئەگەر خوێندەڤان بوونایە بەرهەم پتر دەبوو، هەر كەسێك كاری تایبەتی خۆی هەیە، ئەندازیاران ڕێیان دروست دەكەن، جوتیاران دار هەرمێیان، دار قەیسییان دەچێنن، دار بەڕووان ناچێنن چونكە خۆیان لە دارستانان شین دەبن، ڕاوكەران لە ڕووباران ماسییان دەگرن، لە چیاكان بزن‌و نێرییان ڕاو دەكەن، بەكێردو چەقۆیان وان ڤەدكوژن، ماسێیت دەریایان گەورەن، دارێن چیایان بلندن، ئەم لدەڤەرا بەرواریان دژین، گوندێن ڤی دەڤەری گەلەك خۆشن، بەلام لەزستانێ دا ساردن، بۆیێ پێویستە خوێندكارانی ئەوێ پەنجەران داخەن‌و دەرگایان پێوەدەن تا سەرمایان نەبێ، ئاوی كانییانی ئەو دەڤەرە لە هاویندا تەزی‌و ساردن، باخاتی پڕ لە میوەجاتەو دیمەنی دێهاتی گەلەك جوانە، سەدەها جار لە دیمەنی گوندەكانی شوێنانی دی جوانترە، خەڵكی ڤان گوندا مەڕو پەزو گاگەل بەخێو دەكەن، كوڕێد ڤێ دەڤەری هەمی دلسۆزن بۆ وەلاتێ خۆ)).

## خستنه ڕوو:

١. ئەو پارچە نووسینە ئەگەر بە وردی بخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ژمارەیەك ناوی تێدایە، ئەم ناوانە یەکێك زیاتر نیشان دەدەن وەك ناوەکانی (کوڕان– کچان– ژنان– پیاوان)، کە هەر یەك لەوانە ژمارەیەك نیشان دەدا کە پتر بێ لە یەك، واتە کە گوتت (کوڕان) دیارە مەبەستت پتر لە یەك کوڕە، یان کە گوتت (کچان) دیسان مەبەستت پتر لە یەك کچە، دیاریشە کە نیشانەی کۆکردنەوەی ئەو جۆرە ناوانە (ان)ە، کە دەخرێتە سەر ناوی تاکی کۆتایی هاتوو بە پیتی نەبزوێن بۆ ئەوەی لە تاکەوە بیکا بە کۆ، ئەم نیشانەیە لە هەردوو زاری کوردی کرمانجی خواروو کرمانجی ژوورو نیشانەی سەرەکی کۆکردنەوەی ناوە.

٢. هەر لەناو دەقەکەدا جۆرە ناوێك هەن کە تاکەکانیان کۆتاییان دێ بە چەند بزوێنێکی وەکو (أ - ێ - ی - ۆ ).

ئەو جۆرە ناوانە ئەگەر بکرێن بە کۆ ئەوا لەنێوان ناوەکەو نیشانەکەدا (ی — y )ی نەبزوێن بەکاردێت، بۆ ئەوەی وەکو دیوارێك بکەوێتە نێوان دوو بزوێنەوە، بۆ نموونە هەر لەو پارچە نووسینەدا گەلێك ناوی تاك بەم شێوەیە کراون بە کۆ وەك:

دار هەرمێ کراوە بەدار هەرمێیان

چیا کراوە بە چیایان

ماسی کراوە بە ماسییان

چەقۆ کراوە بە چەقۆیان

گەلێکی دیکەش.

٣. دیسان ئەگەر چاك لە نووسینەكە وردبینەوە، ناوی وامان بەرچاو دەكەوێ كە تاكەكانییان كۆتاییان دێ بە بزوێنی (وو)، كە كۆمان كردۆتەوە لەنێوان ناوەكەو بزوێنەكە، ( و- W ) بەكارهاتووە، لە خوێندەوەشدا دەنگی بزوێنی (وو) كەمێك لە باری ئاسایی كورتتر دەبێتە گۆتن وەك:

دار بەڕوو كە كۆدەكرێتەوە دەبێ بە (داربەڕووان)[1].

مازوو كۆ دەكرێتەوە دەبێ بە (مازووان)

٤. ئەو ناوە تاكانەی كە كۆتاییان بە بزوێنی (ە) دێت كە دەكرێنە كۆ، نیشانەی (ان) بەكاردێتو بزوێنی (ە) تێدەچێت وەك:

پەنجەرە كراوە بە پەنجەران

قوتابخانە كراوە بە قوتابخانان

٥. لە دەقەكەدا هەندێ ناوی دیكەمان بەرچاو دەكەوێ كە لەكاتی كۆكردنەوەیاندا هەندێ نیشانەمان بەكارهێناوە بۆ كۆ وەك نیشانەكانی:

ئـ- (ات، هات، جات ) لە پەیڤەكانی (باخ ← باخات) (دێ← دێهات) (میوە ← میوەجات).

ب- ەها: وەك (جار- جارەها )

كە دیارە ئەم نیشانەیە زۆر كەم بەكاردێو زیاتریش بەلای شێوەی كۆكردنەوەدا دەچێ لە زمانی فارسی.

---

(١) واوی سێیەم ناهێتە نووسین چونكە لە نووسیندا ناكرێ سێ واو بكەونە تەنیشت یەكەوە.

پ- گەل: کە بەزۆری دەخرێتە سەر ناوی گیانلەبەرو جانەوارانەوە، دەبن بە کۆ وەك: (گا ← گاگەل) (کورِ ← کورِگەل) (سەگ ← سەگ گەل)

٦. هەندێ ناوی دیکە لە دەقەکەدا بەرچاو دەکەون کە شێوەی کۆیان بە خۆوە گرتووە، بێ ئەوەی نیشانەی (ان) خرابێتە سەریان، بەڵکو نیشانەکانی (ێن- ێت- ێد) خراوەتە سەریان بۆ ئەوەی لە دۆخی خستنە پاڵدا ئانکۆ: (پالڤەدانێ)دا شێوەی ناوی کۆ پیشان بدەن، گەلێك وشەو پەیڤی لەو جۆرە لە نووسینەکەدا بەرچاو دەکەوێ وەك:

دارێن چیایان

ماسییێت دەریایان

کورێد ڤێ دەڤەری

کە هەریەکە شێوەی کۆی ناوەکە پیشان دەدەن لە دۆخی خستنەپاڵ یان (ئیزافە)دا. ئەم نیشانانە تایبەتن بە زاری کوردی کرمانجی ژوورو.

٧. جاری وا دەبێ بۆ مەبەستی سووککردن، کە ناوەکە بە نیشانەی (ان) کۆ دەکرێتەوە، پیتی (ن) لە قسەکردن دا ناهێتە گۆتنو لە نووسیندا ناهێتە نڤیساندن، وەك ئەو ڕستەی کە لە دەقەکەدا هاتووە.

خەڵکی ڤان گوندا مەڕو پەزو گاگەل بەخێو دەکەن، کە دەبوایە (گوندان) بنووسرێ نەك (گوندا).

## دەستوور:

١. ناوی کۆ، ناوێکە لە کەسێك یان شتێك پتر پیشان بدات، نیشانەی سەرەکی کۆکردنەوەی ناو لە زمانی کوردی (ان)ە، کە دەخرێتە دویماهی ئەو ناوە تاکانەی کە پیتی کۆتاییان نەبزوێنە.

٢. ئەگەر ناوە تاکەکە دویماهی هاتبوو بە بزوێنەکانی (ا- ۆ- ێ- ی)، بۆ کۆکردنەوەی بە نیشانەی (ان)، پیتی (ی- y )ی نەبزوێن دەخەینە نێوان ناوەکەو نیشانەکە وەکو ناوبڕێك لەنێوان دوو بزوێندا.

٣. ناوە تاکە کۆتایی هاتووەکان بە بزوێنی (وو) لەکاتی کۆکردنەوەدا بە نیشانەی (ان)، پیتی نەبزوێنی (و- W ) دەخەینە نێوان ناوەکەوە نیشانەکە.

٤. ناوی تاکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی (ە) کە بە نیشانەی (ان) کۆ دەکرێتەوە، بزوێنەکە لادەبەین.

٥. ژ بلی نیشانەی (ان)، هەندێ نیشانەی دیکە هەن کە ناوی کۆ چێ دەکەن بە تایبەتی لە زاری کوردی کرمانجی خواروو وەك:

٦. (ات- هات- مها- گەل)

٧. هەروەها لە زاری کرمانجی ژووروداو لەدۆخی خستنە پاڵ دا بۆ ناوی کۆ نیشانەکانی (ێن- ێت- ێد) بەکاردێن.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانە لە تاکەوە بگۆڕە بۆ کۆ:

١. ئەو کەوە باش دەخوێنێ.

٢. تە برایێ من ل بازێڕێ ئامێدیێ دیت.

٣. ددانت جوان بشۆ.

٤. دارڤانی دار بڕی.

٥. بە هاوین قوتابی ناچێتە قوتابخانە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوە تاکانە بکە بە ناوی کۆ:

هرچ– دەرزی– دۆتمام– پەڕۆ– کەوا – باخ– چاڤ – چرۆ– زێ– بادی

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە بخوێنەوە، پاشان لە هەر ڕستەیێکدا ناوە (کۆ)یەکە دەربهێنە تاکەکەشی بەرامبەر نووسە.

١. ئەگەر بارانێت نیسانێ ببنەکەر، دبێت ژ ناڤ دەخلا نەکەنە دەر.

٢. ل شوێنا شێرا، ڕویڤی لێ دکەن گێرا.

٣. میوەجات لە هاویناندا زۆرە.

٤. داوەتا میرا، گڕ لە فەقیرا.

٥. ئەم خوێندکارانە بە یەکەم دەرچوون.

٦. تێرم خواردووە لە کاکڵان، نۆرەی توێکڵانە.

## ڕاهێنانی (٤)

لەم دێڕە هۆنراوانەدا هەر ناوێکی کۆ هەیە دەریان بهێنە، لە بەرامبەریاندا چۆنیەتی کۆکردنەوەیان بنووسە.

٦. لە کوێستانێ نەماوە خێرو خۆشی

تەبیعەت هەربینا کفنیشی پۆشی

ئیتر کەس ناگرێ داوێنی کێوان

لە جێیان باری خەم نیشتووە لە لێوان. (هێمن)

٧. وەهارەن، سەیرەن، سەوزەی دیاران

نم کەوت نە دیدەش چون شەو بێداران

پەی دلەی مانیای دەروون مەلالان

سایە بەستەوە خەیمەی گوڵاڵان. (مەولەوی)

٨. لە دوگمەی سینە دوێنی نوێژی شێوان

بەیانیدا سفیدەی باخی سێوان

لە ترسی تەلعەتت ڕۆژ هەروەکو شێت

بەڕوو زەردەی هەڵاتو کەوتە کێوان. (نالی)

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ناوانە لە دۆخی دانەپاڵدا (خستنەسەردا) بەشێوەی کۆ لە ڕستەدا بەکاربهێنە، نیشانەکانی (ێت– ێن– ێد) بەکاربهێنە:

چاڤ – دار – ڕووبار – چیا – کچ

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| | | |
|---|---|---|
| شین دەبن | : | دەڕوێن |
| ئەم لدەڤەرا بەرواریا دژین | : | ئێمە لەناوچەی بەراوریان دەژین. |
| لە دەقەکەدا | : | لە (نصەکە)دا، دەق– نص (بەعەرەبی) |
| لە دۆخی خستنە پاڵدا | : | لە حالەتی ئیزافەدا |
| دارڤان | : | دارەوان |
| لە کوێستانێ | : | لە زۆزانێ |
| هەرینا | : | هەر ئەوەندەت زانی |
| وەهارەن | : | بەهارە، وەرزی بەهارێیە |
| سەیرەن | : | تەماشا بکەن، بەرێ خۆ بدەنێ |
| سەوزەی دیاران | : | سەوزایی، کەسکایی دەشتو کێوان |
| نم | : | خوناڤ ، شەونم |
| نە دەیدەش | : | لە چاوی، ژ چاڤێ |
| چون | : | وەك |
| شەوبێداران | : | ئەوانەی شەو ناخەون |
| پەی | : | بۆ |
| دەروون مەلالان | : | دەروون پڕ لە خەفەتان |
| سایە | : | سێبەر، سە |
| خەیمەی گولاڵان | : | خێوەتی گولاڵان |

# ناوی بچووك كراو

| ناو | پاشگر | ناوی بچووك كراو |
|---|---|---|
| کەپر، بزن | ۆکە | کەپرۆکە، بزنۆکە |
| گۆزە، دیزە | ڵە | گۆزەڵە، دێزەڵە |
| کیژ، چنگ | ۆڵە | کیژۆڵە، چنگۆڵە |
| ئاسك، کرم | ۆڵ | ئاسکۆڵ، کرمۆڵ |
| کار | یلە | کاریلە |
| بەرخ، مێشك | ۆڵە | بەرخۆڵە، مێشکۆڵە |
| مێش، دان | وولە | مێشوولە، دانوولە |
| داس، جام | وولکە | داسوولکە، جاموولکە |
| باخ، دەریا | چە | باخچە، دەریاچە |
| ڕێ، پێ، گوێ | چکە | ڕێچکە، پێچکە، گوێچکە. |
| منداڵ | ۆچکە | منداڵۆچکە. |
| کوڕ، کچ | ك | کوڕك، کچك |
| گرد | ۆلکە | گردۆلکە |
| گوند، مەنجەڵ | ۆك | گوندۆك، مەنجەڵۆك |
| زەلام، کەنگر، ڕوویار | ۆشك | زەلامۆشك، کەنگرۆشك، ڕوویارۆشك |
| برا | لە | برالە |
| جام | یلکە | جامیلکە |

## خستنه ڕوو:

زۆرجار ناوی گشتی یان تایبەتی، لەکاتی ئاخافتنو نووسیندا، لەشێوەی ناوی بچووك کراودا بەکاریان دەهێنن، لەبەر:

١. یان خۆیان ناوی بچووکن.

٢. یان لەبەر نازو خۆشەویستی.

٣. یان بۆ شکاندنیانو کەم کردنەوەی نرخیان.

ئەم ناوانەی کە بمانەوێت لە گەورەکانیان جودایان بکەینەوە، بەهۆی یەکێك لەو پاشگرانەی کە لەسەرێ بەکارمان هێناون، بچووکیان دەکەینەوە.

ئەو پاشگرانەی کە ئەم ناوە گشتییانە بچووك دەکەنەوە، بریتین لەو پیتانەی کە لە پەیڤی (چکۆڵە)دا دەبینرێن (چ، ك، ۆ، ڵ، ە).

بۆ بچووك کردنەوەی ناوێك، پیتێك یان زیاتری ئەو وشەیە لەگەڵ بزوێنێکدا، کە بگونجێت لەگەڵیدا، بەکاردەهێنین، جار جاریش بزوێنەکان بەپێی پەیڤە تازەکە دەگۆڕین ئەم بچووك کردنەوەیەش، دەستوورو بنەمایێکی تایبەتی نییە لە ناوە تایبەتییەکاندا، بۆیە پێویست بە باسکردنی ناکات.

هەندێك جاری وا دەبێت پیتی ( چ ) دەبێتە ( ژ ) وەك لە وشەی (مژە – موژە) کە لە بنەڕەتدا (مووچە)یە، واتە مووی بچووك.

## دەستوور:

**ناوی بچووك كراو، ناوێكە كە بچووكیی وردیی شتێك ڕادەگەنێت وەك: ١- ناوی گشتی بەهۆی ئەم پاشگرانە بچووك دەكرێن (ۆكە، ڵە، ۆڵە، ۆڵ، یلە، ۆلە، وولە، وولكە، چە، چكە، ۆچكە، ك، ۆلكە، ۆشك، لە، یلكە)، مەرجیش نییە هەموو ناوێكی گشتی بچووك بكرێتەوە.**

**٢- بۆ ناوی تایبەتی هیچ دەستوور و بنەمایێكی جێگیر نییە كە پێی بچووك بكرێتەوە، ئەم بچووك كردنەوەیە بەپێی ناوچەو شێوە زمان دەگۆڕێت.**

## ڕاهێنانی (١)

ئـ- مەبەست لە بچووك كردنەوەی ناو چییە؟

ب- ئایا بۆ بچووك كردنەوەی ناوی تایبەتی هیچ دەستوورو بنەمایێك هەیە؟

پ- سێ ناوی گشتی بهێنەرەوەو بە یەكێك لە پاشگرەكان بچووكی بكەوە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم پاشگرانە بۆ بچووك كردنەوەی ناوی گشتی بەكاردێن، بۆ هەر یەكەیان دوو ناوی گشتی بهێنەو پێیان بچووك بكەرەوە:

(چە، ۆلكە، ۆكە، ۆڵە)

# جێناوی کەسیی لکاو

## - ئ -

### نموونەکان:

١. عەزیزم بۆچی تۆراوی[1] لە خۆڕا[2]؟
چ قەوماوە؟ دڵی تۆ بۆچی گۆڕا؟
ئەتۆ وا زوو لەبیرت کردم ئەمما
فەرامۆشت نەکەم[3] شەرتە لە گۆڕا.

٢. دەچێتە سەر داریٚ لە ڕۆژی ئینتیقام و تۆڵەدا
ئەو کەسەی کوشتی بە ناهەق پێشەواو سەرداری کورد
نایەڵن ئادار بەسەر پاداری[4] ئەو دەربارەوە
چونکە دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد، پاداری کورد

٣. قەت واتێنەگەن چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لەناو دۆشەکا کەی هەق سەنراوە؟

٤. بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و زەمانیٚ عەینی قەلغان و سوپەرتانە

٥. هاتن شەهیدەکان بە جلی سووری خوێنەوە
دایکی وەتەن دە هەڵسە سلاویان بسێنەوە

---

(١) تۆراوی= زیز بووی.

(٢) لەخۆڕا= بەبیٚ هیچ هۆیەك.

(٣) فەرامۆشت نەکەم= لەبیرت نەکەم، تەژبیر نەکەم.

(٤) ئادارو پادار= دارو پەردو، کەرەستەی بیناسازی.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەیری ئەم نموونە هۆنراوانەی لای سەرەوە بکەین دەبینین، لە هەموویاندا جۆرە جێناوێکمان بەکار هێناوە کە یەکسەر بە هەندێ لە وشەکانەوە نووساون، ئەو جێناوانە، لەجیاتی جێناوە کەسییە سەربەخۆکان بەکارهاتوون.

لە کۆپلە هۆنراوەی یەکەمدا هەردوو جێناوی (م- ت )ی لکاو بەکارهاتوون، کە یەکەمیان لە شوێنی جێناوی سەربەخۆی (من)ی کەسی یەکەمی تاکو دووەمیشان لەجیاتی جێناوی سەربەخۆی (تۆ)ی کەسی دووەمی تاك بەکارهاتووە، شاعیر کە دەڵێ (لەبیرت کردم) مەبەستی ئەوەیە بڵێ ( تۆ منت لەبیر کرد )، واتە جێناوی لکاوی (ت) شوێنی تۆی گرتووە، هەروەها جێناوی لکاوی (م) شوێنی (من)ی گرتووەتەوە، کە هەردووکیان لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕی (لەبیرت کردم)دا بەکارهاتوون.

٢. لە کۆپلە هۆنراوەی دووەمدا جێناوی لکاوی (ی) کە بەهەردوو کاری ڕابوردووی تێپەڕی (کوشتی- دەیگوت)ەوە لکاوە، جێی ئەو کەسە دەگرێتەوە کە لەباری یەکەمدا کوشتنەکەی جێ بەجێ کردووەو لە باری دووەمیشدا گوتنەکەی ئەنجام داوە. ئەو کەسەش، دیار نییە پێی دەگوترێ کەسی سێیەمی تاك.

لە جێناوە کەسییە سەربەخۆکانیش بە (ئەو) دهێتە دەست نیشان کردن.

٣. لە سێیەم کۆپلەدا جێناوی لکاوی (مان) لە جیاتی ئێمە بەکارهاتووەو خراوەتە سەر ناوی چاوو بووە بە (چاومان) کە مەبەست پێی چاوی ئێمەیە، واتا (مان) کە هەر خۆی شێوەی کۆی جێناوی لکاوی (م)ی کەسی یەکەمی تاکە، بۆ کەسی یەکەمی کۆ بەکار هاتووە.

٤. لە دێرە هۆنراوەی ژمارە (٤)، دووجار جێناوی لکاوی (تان) بەکارهاتووە، لە هەردوو جاریشدا بەناوێکەوە لکاوە، (دوژمنتان، سوپەرتانە)، ئەم جێناوە دەگەڕێتەوە بۆ کەسی دووەمی کۆو لە جێی (ئێوە، ئەنگۆ) بەکارهاتووە، دیارە ئەمەشیان کۆی جێناوی لکاوی (ت)ی کەسی دووەمی تاکە.

٥. هەروەها لە دێرە هۆنراوەی دواییشدا جێناوی (یان) خراوەتە سەر ناوی (سڵاو)و بووە بە سڵاویان کە مەبەست پێی سڵاوی ئەوانە، واتە لەباتی جێناوی کەسی سەربەخۆی (ئەوان) بەکارمان هێناوە کە کەسی سێیەمی کۆیە، هەر خۆیشی شێوەی کۆی جێناوی (ی)یە.

## دەستوور:

**جێناوە لکاوەکان ئەوانەن کە شوێنو جێی جێناوە کەسیە سەربەخۆکان دەگرنەوە لە ئاخافتنو نووسیندا، ئەو جێناوانەش بە تەنیا هیچ مەبەستێك نە لە ئاخافتنو نە لە نووسیندا نادەن بەدەستەوە، بەڵام کە لکان بە وشەکانی پێش خۆیانەوە ئەوا مەبەست دەپێکن، لەڕووی چالاکیو هێزیشەوە دەگرێن بە دوو جۆر:**

ئـ- جێناوه كەسییه لكاوه بەهێزەكان: ئەوانه بوون باسمان كردن‌و بـه كورتی بریتین له:

١. م جێی (من)ی كەسی یەكەمی تاك دەگرێتەوه.
٢. مان جێی (ئێمه)ی كەسی یەكەمی كۆ دەگرێتەوه.
٣. ت جێی (تۆ)ی كەسی دووەمی تاك دەگرێتەوه.
٤. تان جێی (ئێوه)ی كەسی دووەمی كۆ دەگرێتەوه.
٥. ی جێی (ئەو)ی كەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوه.
٦. یان جێی (ئەوان)ی كەسی سێیەمی كۆ دەگرێتەوه.

ب- جێناوه كەسییه لكاوه بێ هێزەكان

## ڕاڤەكردنی پەیڤەكان:

تۆراوی : زیزبووی، سل بووی.

له خۆڕا : بەبێ هیچ هۆیەك.

فەرامۆشت نەكەم : لەبیرت نەكەم، تەژبیر نەكەم.

ئادارو پادار : دارو پەردوو، كەرەستەی بیناسازی.

دەربار : كۆشك‌و بالاخانەی پاشا، بلاط

# جێناوی کەسی لکاو

- ب -

## ئەم دەقە بخوێنەوە:

**((ژمارەیەك هەڤاڵ‌و دۆست چوون بۆ ڕاوەماسی من یەکەم جارم بوو دەچووم بۆ ئەو جۆرە ڕاوە، هەڤالێکم پێی گوتم: تۆ مەلە دەزانیت؟ ئەو کەسەی مەلە کردن دەزانێت لەو جۆرە ڕاوەدا پەکی ناکەوێ، کە ماسی دەگرن ئاگاداری خۆتان بن، چونکە ڕووبار ئاوی زۆرە. جارێکیان لەگەڵ دەستەیێك برادەرو هەڤاڵ لە ڕاوە ماسیدا بەژداریم کرد، ئەوان هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ ئەو شوێنەی ئێستا ئێوە بۆی دەچن، هەمووشیان مەلەوانی چاك بوون بەتایبەتی ئاراسی هەڤاڵم کە مەلە باسکە چاك دەکات)، ئەو لەگەڵ هەڤالانی چوو بۆ ڕاوەکە، هیوام وایە ئەنگۆش لەو ڕاوەدا سەرکەوتووبن)).**

## خستنە ڕوو:

لە خوێندنەوەی ئەو چەندە ڕستە ساکارەی لای سەرەوە، ئەوە تێدەگەین کە ئاخێوەر یان قسەکەر نە بەتەنێ، بەڵکو لەگەڵ کۆمەڵێك هەڤاڵ‌و دۆست ڕاوە ماسییان دەکرد، کە جۆرە وەرزشێکی سوود بەخشەو پێویستە بەپێی توانا بایەخی پێ بدرێ‌و شێوازی ئەنجامدانی ڕێك بخرێ، لە ڕستەکاندا ژمارەیەك جێناو هەن کە لەگەڵ ژمارەیەك کاری جۆراو جۆر بەکارهاتوون:

١. لە ڕستەی (ژمارە هەڤاڵو دۆستێك چووین بۆ ڕاوە ماسی) جێناوی لکاوی (ین) لەگەڵ کاری (چوو)ی ڕابوردووی تێنەپەڕ بەکارهاتووەو جێی (ئێمە- ئەمە)ی کەسی سێیەمی کۆی گرتووەتەوە.

٢. لە ڕستەی (من یەکەم جارم بوو دەچووم بۆ ڕاوەماسی)، جێناوی کەسیی لکاوی (م) بۆ کەسی یەکەمی تاك بەکارهاتووەو خراوەتە سەر کاری ڕابووردوی تێنەپەڕی (چوو).

٣. بەڵام ئەگەر سەرنجی ڕستەی پرسیاری، تۆ مەلە دەزانیت؟ بدەین، دەبینین جێناوی کەسی لکاوی (یت- ی) لەگەڵ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕی (دەزانیت) بەکارهاتووەو جێی کەسی دووەمی تاکی گرتووە.

٤. هەروا لە ڕستەی (ئەو کەسەی مەلەکردن دەزانێت لەو جۆرە ڕاوەدا پەکی ناکەوێ) دەبینین جێناوی کەسی (ێت- ێ) خراوەتە سەر هەردووکاری ڕانەبوردووی تێپەڕی (دەزانێت)و (پەکی ناکەوێ)و جێی کەسی سێیەمی تاکی گرتووە.

٥. ئنجا لە سەرنجدانی ڕستەی (ئەوان هەموو ساڵێك دەهاتن بۆ ئەو شوێنەی ئێستا ئێوە بۆی دەچن).

دەبینین دووجار لەگەڵ دووکاردا جێناوی کەسی لکاوی (ن) بەکارهاتووە، جارێك لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕی (دەهاتن) جارێکیش لەگەڵ کاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕی (دەچن). لە جاری یەکەمدا (ن) لەگەڵ کاری (دەهاتن) وەکو جێناوێکی لکاو جێی

کەسی سێیەمی کۆ دەگرێتەوە کە (ئەوان)ن و لە جاری دووەمیشدا لەگەڵ کاری (دەچن) هەر ئەو جێناوە لکاوە شوێنی کەسی دووەمی کۆ دەگرێتەوە کە (ئێوە)ن.

٦. هەر بەم شێوەیە ئەگەر بەرێ خۆ بدەینە ڕستەی (هەمووشیان مەلەوانی چاك بوون، بەتایبەتی ئاراسی هەڤاڵم، کە مەلە باسکە چاك دەکا (ت)، ئەو لەگەڵ هەڤاڵانی چوو بۆ ڕاوەکە).

دەبینین لەگەڵ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕی (دەکا- دەکات)دا جێناوی کەسی لکاوی (ا- ات) بەکارهاتووە کە جێی کەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوە، واتە لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین کە هەندێ کاری ڕانەبوردووی تێپەڕ، ئەوانەی لەو بەشەیان دا کە دەکەوێتە پێش جێناوە لکاوەکان کۆتاییان بە بزوێنی، (ە- ۆ) دێت لەگەڵ کەسی سێیەمی تاك جێناوی لکاوی (ا- ات) وەردەگرن وەك:

دەخوا (ت)، دەکا (دەکات)، دەڕوا (ت)، دەبا (ت)

کەچی دەبینین کاری (چوو) کە ڕابوردووی تێنەپەڕە لەگەڵ کەسی سێیەمی تاکدا جێناوی لکاو وەرناگرێت.

| جێناو | کەسی یەکەم | | کەسی دووەم | | کەسی سێیەم | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | تاك | کۆ | تاك | کۆ | تاك | کۆ |
| جێناوی کەسی سەربەخۆ | من | ئێمە | تۆ | ئێوە | ئەو | ئەوان |
| جێناوی کەسی لکاو | م | ین | یت (ی) | ن | ێت (ێ)<br>ات (ا) | ن |

## دەستوور:

دەستەی بێ هێزی جێناوە کەسییە لکاوەکان وەك دەستەی یەکەم چالاك نین، بەڵام بەشێکی گرنگی ڕستە پێك دەهێنن و دەچنە سەر گەلێك بەشی ئاخاوتن، بە تایبەتی سەرکار. ئەم دەستەیەش بریتییە لە:

١. م : بۆ کەسی یەکەمی تاك.

٢. ین : بۆ کەسی یەکەمی کۆ.

٣. یت (ی): بۆ کەسی دووەمی تاك.

٤. ن : بۆ کەسی دووەمی کۆ.

٥. ێت (ێ): بۆ کەسی سێیەمی تاك، جاری وایش هەیە (ات- ا) بەکاردێ.

٦. ن : بۆ کەسی سێیەمی کۆ.

٧. دەستەی بێ هێز، هەروەك ڕوونمان کردەوە، لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ (کەسی سێیەمی تاك نەبێ) بەکاردێن، هەروەها لەگەڵ ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕیش بەکاردێن، جگە لەوەی کە دەچنە سەر بەشێکی زۆری تری ئاخافتن وەك: ناو- هاوەڵناو- زۆربەی جێناوەکان- هاوەڵکار...

# جێناوی کەسیی لکاو

## - پ -

### نموونەکان:

( ئـ )

١. ئەز شەڤێ دی لسەربانی نڤستم.

٢. ئەم هاڤینێ لسەربانا (دنڤین).

٣. تو ڕێزمانا کوردی دخوینی.

٤. هوین ڕابوون و کەلا[1] زۆرداریێ هەرفاند.

٥. ئەو گەلەك نامان بۆ هەڤالێن خۆ دنڤیسی (دنڤیسە).

٦. ئەو دوهی هاتنە ڤێرێ.

( ب )

١. تە ئەز دیتم

٢. من تو دیتی.

٣. ئەوی ئەو دیت.

٤. تە ئەم دیتن.

٥. من هوین دیتن.

٦. ئەوی ئەو دیتن.

---

(١) کەلا= قەڵا، قەڵات.

## خستنه ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی لای سەرەوە دەبینین لە کۆمەڵە ڕستەی (ئـ)دا ئەو جێناوە کەسییە سەربەخۆیانەی کە بەکارهاتوون وەك: (ئەز، ئەم... هتد) هەموویان لە دەوری (بکەر)دا بەکارمان هێناون‌و هەریەکەیان جێناوێکی کەسیی لکاوی لەگەڵدا بەکارهاتووە کە بەکارەکەوە نووساون‌و هەمان دەور دەبینین.

ئەوەتا لە ڕستەی یەکەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (م) بەکاری ڕابوردووی تێنەپەڕی (نڤست)ەوە نووساوەو شوێنی (ئەز)ی بکەری لە ڕستەدا گرتووە کە کەسی یەکەمی تاکە.

لە ڕستەی دووەمیشدا جێناوی (ین) بەکاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕی (دنڤین)ەوە نووساوەو شوێنی (ئەم)ی بکەری گرتووە کە بۆ کەسی یەکەمی کۆیە. لە ڕستەی سێیەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (ی) بەکاری ڕانەبردووی تێپەڕی (دخوینی)یەوە نووساوەو جێی (تۆ)ی بکەری گرتووە، بۆ کەسی دووەمی تاك.

لە ڕستەی چوارەمدا جێناوی کەسیی لکاوی (ن) خراوەتە سەر کاری ڕابوردووی تێنەپەڕی (ڕابوو)، جێی (هوین)ی جێناوی کەسیی سەربەخۆی گرتۆتەوە کە بۆ کەسی دووەمی کۆیە.

لە ڕستەی پێنجەمدا جێناوی (ی) خراوەتە سەر کاری ڕانەبوردووی تێپەڕی (دنڤیسی)و شوێنی (ئەو)ی کەسی سێیەمی تاك دەگرێتەوە کە بکەرە واش دەبێ ئەو جێناوە شێوەی (ە) وەردەگرێت‌و بە کارەکەوە بلکێ وەکو لە ڕستەکەدا دیارەو نووسراوە (دنڤیسە).

لـه ڕسـتـه‌ی شه‌شـه‌مدا جێنـاوی که‌سـیی لكـاوی (ن) له‌سـه‌ر كـاری ڕابوردووی تێنه‌په‌ڕی (هات) دانراوه‌و له‌باری (بكـه‌ر) دایـه‌و جێـی که‌سـی سێیه‌می کۆ ده‌گرێته‌وه.

لـه کۆمه‌ڵـه ڕسـتـه‌ی (ب) دوو ده‌سـتـه جێنـاوی که‌سـیی سـه‌ربه‌خۆ بـه‌كارهاتووه. جێناوه‌كـانی ده‌سـتـه‌ی یه‌كـه‌میان لـه دۆخـی بكـه‌ر دان‌و ئه‌وانه‌ی ده‌سته‌ی دووه‌م خۆیان‌و جێناوه که‌سییه لكاوه‌كانی سه‌ر به‌وان له دۆخی به‌ركاردان‌و ئه‌و جێناوه لكاوانه‌ش هه‌ر ئه‌وانه‌ی پێشووترن.

له‌ڕسته‌ی (تـه ئـه‌ز دیـتم)دا، جێنـاوی که‌سـیی سـه‌ربه‌خۆی (تـه) لـه دۆخـی بكـه‌ر دایـه‌و جێنـاوی که‌سـیی سـه‌ربه‌خۆی (ئـه‌ز) لـه دۆخـی به‌ركاردایه‌و جێنـاوه که‌سـییه لكاوه‌كه‌شـی بـه‌كاری (دیـت)ی ڕابـوردووی تێپه‌ڕه‌وه نووساوه‌و ئه‌ویش له دۆخی به‌ركاردایه.

هه‌ر به هه‌مان شێوه له‌ڕسـتـه‌كانی تـریش یـه‌ك لـه‌دوای یـه‌ك جێنـاوه که‌سییه لكاوه‌كانی (ی، ین، ن، ن) له دۆخی به‌ركاردا به‌كارهاتوون.

## ده‌ستوور:

**جێناوه که‌سییه لكاوه‌كان كـه له‌شـێوه زاری كـوردی كرمـانجی ژووروودا به‌كاردێن، هه‌ر ئه‌وانه‌ن كه ده‌سته‌ی دووه‌می جێنـاوه که‌سـییه لكاوه‌كـانی شێوه زاری كـوردی كرمـانجی خـواروو بـه‌كاریان ده‌هێنـێ، له‌گـه‌ڵ كـه‌مێك جیاوازی له‌شێوه‌و فۆرمی هه‌ندێكیان، ئه‌وه‌نده هه‌یه، له‌م شێوه زاره‌دا بـه زۆری جێناوه که‌سییه سه‌ربه‌خۆكان له ڕسته‌دا ناو ده‌برێن.**

**ئه‌و جێناوه که‌سییه لكاوانه‌ش له (دوو دۆخ ) دا به‌كاردێن:**

١. لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕو ڕانەبوردووی تێپەڕو تێنەپەڕ کە لەو بارەدا لە دۆخی (بکەر)دا بەکاردێن.

٢. لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕ لەو بارەشدا لە دۆخی (بەرکار) بەکاردێن.

| ژمارە | کەس | جێناوی لکاو |
|---|---|---|
| تاك | یەکەم | م |
| | دووەم | ی |
| | سێیەم | ی، ە |
| کۆ | یەکەم | ن (ین) |
| | دووەم | ن |
| | سێیەم | ن |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم کارانە لەگەڵ جێناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی (ج) بەکاربێنە:

هات ، گرت

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم جێناوە کەسییە سەربەخۆیانە بە جێناوی کەسیی لکاو بگۆڕە، وەك نموونەی (ب):

ئـ- تۆ (هاتن) بۆ قوتابخانە.

ب- هاتیت بۆ قوتابخانە.

١. من (چوون) بۆ دهۆك.

٢. ئێمە (خواردن) خوارد.

٣. ئێوە هەموو ڕۆژێك (جل شتن).

٤. تۆ چیرۆکەکە (خوێندنەوە).

٥. ئەوان هەمیشە بە ڕۆژ (نووستن).

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێڕە هۆنراوانەدا جێناوە کەسییە لکاوەکان دەست نیشان بکەو کەسەکانیشیان دەربخە:

١. هـاوار بـە مـالّم چـیمان پێکـرا

لـە چـارەکێکا سـەدمان لێخـرا

هێـشتا خـەڵاتیان ئەکـەن بـە بـەرا

دەك خەجاڵت بـن لـەڕۆی مەحـشەرا

ئێمەش خاکی خەم ئەکەین بەسـەرا

٢. به شمشێری دوو ئەبرۆت جەرگی خەڵکی لەت دەکەی دیارە
دەزانی چەك لەکار بێنی، کچیش بی تورمەی مادی
لە سویَ یانت وەها دێوانە بووم چاو مەستی خوێن شیرین
لەقەڕنی بیستەما ڕەنگە ڕەچاو کەم کاری فەرهادی

٣. هەرچی درەختەگری تێبەردەن
پەپوولەی هیوای من ناسوتێنیٚ
بای پایز هەمووی بەجاریٚ هەڵکەن
ئەم خونچە وردەی من ناوەرێنیٚ
چۆن ئەو ڕۆژە ئەبینم هەڵات
ئاواش دڵنیام ئەگەین بە ئاوات

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستەیەی خوارەوە بگۆڕە، لەگەڵ گۆڕینی جێناوە کەسییە لکاوەکان بۆ:

١. کەسی یەکەمی کۆ.
٢. کەسی دووەمی تاك.
٣. کەسی سێیەمی کۆ.
٤. کەسی دووەمی کۆ.

( من زۆر بەخێرایی باری ژیانم دەگۆڕم )

## ڕاهێنانی (٥)

ئەم ڕستانە بۆ ئەو جێناوانەی بەرامبەریان بگۆڕە:

١. ئەو دەیەوێت عیراق لە ڕووی پیشەسازییەوە پێش بخات. (ئێمە)

٢. تۆ گەلێك شتی سەیرو بە کەڵکت داهێناوە. (ئێوە)

٣. زۆرم پێخۆشە بێیت بۆ لام. (ئەوان)

٤. دوێنیێ چاو بە هاوڕێکەم کەوت. (تۆ)

## ڕاهێنانی (٦)

ئەم ڕستانە شیبکەوە:

١. ئەوان سێو دەخۆن.

٢. من دەستیێ وی گرت.

٣. دوێنی براکەتم دیت.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| | | |
|---|---|---|
| لەڕۆی مەحشەرا | : | لەڕۆژی مەحشەردا. |
| تورمە | : | نەسل، بەرە |
| سویێ | : | ئارەزوو، تامە، سەوەس. |

# هاوەڵناو

١. کۆتری سپی نیشانەی ئاشتییە.
٢. کوردستان بەئێوەی تێکۆشەر سەردەکەوێت.
٣. سەیرانەکەمان خۆش بوو.
٤. ئەسپی چاك ئاوزەنگی ناوێت.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین دەبینین:

١. لە ڕستەی یەکەمدا وشەی (سپی) وەسفی ناوی (کۆتر)ی کردووە بەهۆی ئامرازی خستنە سەری (ی)یەوە بووەتە دیارخەری ناوەکە، بۆی ڕوونکردووینەوە کە چ کۆترێکمان مەبەستە، لەبەر ئەوە بە وشەی (سپی) دەوترێت (هاوەڵناو).

٢. لە ڕستەی دووەمدا وشەی (تێکۆشەر) وەسفی جێناوی (ئێوە)ی کردووە بەهۆی ئامرازی خستنەسەری (ی) بووەتە دیارخەری جێناوەکە، بۆی ڕوونکردووینەوە کە بە کێ کوردستان سەردەکەوێت، لەبەر ئەوە بە وشەی (تێکۆشەر) دەوترێت (هاوەڵناو).

٣. لە ڕستەی سێیەمدا وشەی (خۆش) واتای کاری ناتەواوی (بوو)ی تەواوکردووە، بووە بە تەواوکەری کارە ناتەواوەکە بەبێ

یاریدەری ئامرازی خستنەسەر، لەبەر ئەوە بە وشەی (خۆش) دەوترێت (هاوەڵناو).

٤. لە ڕستەی چوارەمدا بە هەمان شێوەی ڕستەی یەکەم وشەی (چاك) وەسفی ناوی (ئەسپ)ی کردووە، بووە بە دیارخەری ناوەکە، بە یاریدەی ئامرازی خستنە سەری (ی)یەوە بۆی ڕوونکردووینەوە کە چ ئەسپێك ئاوزەنگی ناوێت، لەبەر ئەوە بە وشەی (چاك) دەوترێت (هاوەڵناو).

## دەستوور:

**هاوەڵناو وشەیەکە بۆ وەسفی ناوێك یان جێناوێك بەکاردێتو دەبێتە دیارخەری ناوەکە یان جێناوەکە هەروەها هاوەڵناو دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو.**

# هاوەڵناوی چۆنییەتی

١. مرۆڤی باش سەردەکەوێت.

٢. ترێی ڕەش بکڕە.

٣. ماسیی گەورە لە ڕووبارەکەدا هەیە.

٤. شیرین کچەکا نازدارە.

٥. خانووەکە کۆن بوو.

٦. مرۆڤی نیشتمان پەروەر سەرفرازە.

٧. ئێوەی زیرەك بە ئامانج دەگەن.

٨. گۆتنا خۆش بهارا دلانە.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی سەرەوە. دەبینین ئەو وشانەی کە هێلیان بە ژێرەوە کێشراوە، وەك {باش، ڕەش، گەورە، نازدار، کۆن، نیشتمان پەروەر، سەرفراز، زیرەك، خۆش} هەموویان هاوەڵناوی چۆنین چونکە هەر یەکەیان وەسفی ناوێك یا جێناوێکی کردووە واتە بووە بە دیارخەری ناوەکە یان جێناوەکە، یاخود بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواو. وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (باش) وەسفی ناوی (مرۆڤ)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوەکە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (ڕەش) وەسفی ناوی (ترێ)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوی ترێ.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (گەورە) وەسفی ناوی (ماسی)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوی ماسی.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (نازدار) وەسفی ناوی (کچ)ی کردووەو دیارخەری ناوی (کچ).

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (کۆن) بووەتە تەواوکاری کاری ناتەواوی (بوو). وەسفی ناوەکەی کردووە.

٦. لە ڕستەی شەشەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (نیشتمان پەروەر) وەسفی ناوی (مرۆڤ )ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوەکە. هەروەها هاوەڵناوی چۆنیەتی (سەرفراز) بووەتە تەواوکەری کاری ناتەواوی (ە). وەسفی ناوی مرۆڤی کردووە.

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (زیرەك) وەسفی جێناوی (ئێوە)ی کردووەو بووەتە دیارخەری جێناوی ئێوە.

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی (خۆش) وەسفی ناوی (گۆتن)ی کردووەو بووەتە دیارخەری ناوەکە.

## دەستوور:

**هاوەڵناوی چۆنیەتی:** ئەو هاوەڵناوەیە کە لە ڕستەدا وەسفی ناوێك یا جێناوێك دەکات‌و دەبێتە دیارخەری ناوەکە یا جێناوەکە، یاخود دەبێتە تەواوکەری کاری ناتەواو. لە کاتێکدا کە دەبێتە دیارخەری ناو یا جێناو. ئامرازی دانە پاڵ (خستنە سەر) دەخرێتە نێوانیان.

١. لە زاری کرمانجی خواروو (ی) بەکاردەهێنرێ.

٢. لە زاری کرمانجی ژووروو بەم شێوەیە:

ئـ ئەگەر ناوەکە نێری تاك بوو (ێ) بەکار دەهێنرێ.

ب- ئەگەر ناوکە مێی تاك بوو (ا) بەکار دەهێنرێ.

پ- ئەگەر ناوەکە کۆ بوو نێر یا مێ {ێت- ێد- ێن} بەکاردەهێنرێ.

ئامرازی دانە پاڵ (خستنەسەر) دەخرێتە نێوانیان ئەگەر هاوەڵناوی چۆنیەتی لە دوای ناوەکە یا جێناوەکە بێت. بەڵام ئەگەر هاوەڵناوی چۆنیەتی کەوتە پێش ناوەکە ئامرازی دانە پاڵ (خستنەسەر) پێویست نییە. وەکو: { سۆر گوڵ، ڕەش گوڵ} (وەکو ناوێکی لێکدراو).

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هەر هاوەڵناوێکی چۆنیەتی هەیەدەری بهێنەو ئەرکەکەی دیاربکە.

١. پێ لە تەختەی چرووك مەنێ.

٢. مە چاڤێن بەلەك دیتن.

٣. هەنار میوەیەکێ خۆشە.

٤. یارمەتی مرۆڤی هەژار بدەن.

٥. پرچا بەفرینێ زەرە.

٦. ڕێزی مرۆڤی مەزن بگرن.

٧. شێرکۆ کوڕەکی ئازایە.

٨. چیایێن کوردستانێ بلندن.

٩. ئێوەی تێکۆشەر سەر دەکەون.

## ڕاهێنانی (٢)

شەش ڕستە بهێنەرەوە کە هاوەڵناوی چۆنیەتی تێدابێت.

سێیانیان دیارخەری ناوبن، دووانیان دیارخەری جێناوبن، یەکێکیان تەواوکەری کاری ناتەواو بێ.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێڕە هۆنراوانەی خوارەوەدا هەر چ هاوەڵناوێکی چۆنیەتی هەیە دەری بهێنە:

١. نەغمەی شیرین ئاوازی خۆش لە دەنگا
ورشەی سەرنج لە ناو چاوێکی مەنگا (کامەران موکری)

٢. چاوی کاڵ ئەگەر چی نەرمە
بەڵام نیگای ئێجگار گەرمە. (کامەران موکری)

٣. شاخێکی بەرزو سەوزو سەخت بووم
پڕ گوڵو نەسرین پڕ لە درەخت بووم. (سەلام)

٤. کەنگیێ دێ هێت ئەو بهارا سۆرو شینو ئالو زەر
خۆش ببن مە بەزمو جۆشو سازەو سەیرانە دل. (د. مەسعود کەتانی)

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. دراوی سپی بۆ ڕۆژی ڕەشە.

٢. سێوی باش بکڕە.

٣. دەستمالا نەسرینێ جوانە.

( وانەی نۆیەم )

# جۆرەکانی هاوەڵناوی چۆنییەتی

## ( لەڕووی دروستکردنییەوە )

ئـ/

١. گوڵی جوان بچێنە.

٢. هەناری ترش مەکڕە.

٣. ئاوی کانی پاکە.

٤. تۆی زیرەك دەردەچیت.

٥. چەند چیا بلند بن نهال کویر دبن.

٦. درەختی سەوز جوانە.

٧. سۆلاڤ هاڤینگە هەکا خۆشە.

٨. من بەژنا زراڤ دیتی‌یە.

ب/

١. بهارا کوردستانێ گەلەکا ڕەنگینە.

٢. کتێبی بەسوود بخوێنەوە.

٣. مرۆڤێ دەشتەکی بەهێزە.

٤. مرۆڤێ بێ بەخت سەرناکەڤیت.

٥. گەلێن هشیار پێش دکەڤن.

١. یارمەتیی مرۆڤی دڵسووتاو بدەن.

٢. لە مرۆڤێ زارخۆشی زگ ڕەش دویر کەڤە.

٣. گولیزار کچەکا ڕووخۆشە.

٤. موحەمەد عارفێ سترانبێژ هونەرمەندەکێ مەزن بوو.

٥. پیاوی دەست بڕ لەناو دەچێت.

## خستنه ڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین پەیڤەکانی {جوان، ترش، پاك، زراڤ}. هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین و بوونەتە دیارخەری ناوێك یا جێناوێك یاخود تەواوکەری کاری ناتەواو. بەڵام ئەگەر لە ڕووی دروست بوونیانەوە سەیریان بکەین، دەبینین کە هەر یەکەیان تەنها لە یەك وشەی واتادار پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێ هاوەڵناوی سادە.

ب- ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین وشەکانی {ڕەنگین، بەسوود، دەشتەکی، بێ بەخت، هشیار (هوشیار)}. هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین و بوونەتە دیارخەری ناوێك یا تەواوکەری کاری ناتەواو. بەڵام لەڕووی دروست بوونیانەوە هەر یەکەیان لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پێشگرێك یا لەگەڵ پاشگرێك پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوتری هاوەڵناوی داڕێژراو. وەکو:

١. لە ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو (ڕەنگین) لە وشەی ڕەنگ لەگەڵ پاشگری (ین) پێکهاتووە.

٢. لەڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو {بەسوود} لە پێشگری (بە) وشەی (سوود) پێکهاتووە.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو (دەشتەکی) لە وشەی (دەشت)و پاشگری (ەکی) پێکهاتووە. هەروەها هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو {بەهێز} لە پێشگری (بە) لەگەڵ وشەی (هێز) پێکهاتووە.

٤. له ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو {بێ بەخت} له پێشگری (بێ) لەگەڵ وشەی (بەخت) پێکهاتووە.

٥. له ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی داڕێژراو {هشیار} (هۆشیار) له وشەی (هش) (هۆش) لەگەڵ پاشگری (یار) پێکهاتووە.

پ- دیسان ئەگەر سەیری ڕستەکانی (پ) بکەین، دەبینین وشەکانی {دڵسووتاو، زارخۆش، زگ ڕەش، ڕووخۆش، سترانبێژ، دەست بڕ} هەموویان هاوەڵناوی تەواون، بەڵام له ڕووی دروست بوونیانەوە هەریەکەیان له دوو وشەی واتا دار یا پتر پێکهاتووە، لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێ هاوەڵناوی لێکدراو. وەکو:

١. له ڕستەی یەکەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی لێکدراو {دڵسووتاو} له دوو وشەی واتادار {دڵ- سووتا} لەگەڵ پاشگری (و) پێکهاتووە.

٢. له ڕستەی دووەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی لێکدراو (زارخۆش) له دوو وشەی واتادار {زار- خۆش} پێکهاتووە. هەروەها هاوەڵناوی چۆنیەتیی لێکدراو (زگ ڕەش) له دوو وشەی واتادار (زگ- ڕەش) پێکهاتووە.

٣. له ڕستەی سێیەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی لێکدراو (ڕووخۆش) له دوو وشەی واتادار (ڕوو- خۆش) پێکهاتووە.

٤. له ڕستەی چوارەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتی لێکدراو (سترانبێژ) له دووشەی واتادار (ستران/ بێژ) پێکهاتووە.

٥. له ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی چۆنیەتیی لێکدراو (دەست بڕ) له دوو وشەی واتا دار {دەست- بڕ} پێکهاتووه.

## دەستوور:

**هاوەڵناوی چۆنیەتی لەڕووی دروستکردنییەوە سێ جۆرە:**

**ئـ- هاوەڵناوی سادە: ئەوەیە کە لەیەك وشەی واتادار پێکهاتووە.**

**بـ- هاوەڵناوی دارێژراو: ئەوەیە کە لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پاشگرێك یان پێشگرێك پێکهاتووە.**

**پـ- هاوڵناوی لێکدراو: ئەوەیە کە لە دوو وشەی واتادار یا پتر پێکهاتووە.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵناوی چۆنیەتی دەربهێنەو جۆرەکەی دیار بخە:

١. باخێ مه یێ جوانه.

٢. مرۆڤی دەست کورت هەیە.

٣. ئاوی کانی سازگارە.

٤. پیاوی سەرکز هەمیشه دڵتەنگە.

٥. گوڵناز کچەکا بەژن زراڤە.

٦. کاری نارێك سەر ناگرێت.

٧. من خەنجەرەکا دەسك زێڕ کڕی.

٨. گوندێ وان یێ دویرە.

## ڕاهێنانی (٢)

جیاوازی لەنێوان هاوەڵناوی داڕێژراوو لێکدراودا چییە؟ بە نموونە ڕوونی بکەرەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

شەش هاوەڵناوی چۆنیەتی بهێنەوەو لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە سێیانیان لێکدراو بن‌و سێیانیان داڕێژراوبن. لێکدراوەکان ببنە دیارخەری ناو، داڕێژراوەکان ببنە تەواوکەری کاری ناتەواو.

## ڕاهێنانی (٤)

### . شیکردنەوە (شلۆڤەکردن)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. گەلی ژێر دەست تێدەکۆشێت.

٢. مە زنجیرا ستویر شکاند.

# پلەکانی هاوەڵناوی چۆنیەتی

ئـ/

١. ئارووی ناسك بكرە.

٢. ئاوی كانییەكە ساردبوو.

٣. گولێن مە گەش بوون.

٤. ئێوەی تێگەیشتوو سەردەكەون.

٥. ئاڤا شیرین ڤەخۆ.

ب/

١. گوڵناز لە نەرمین زیرەكترە.

٢. ئازاد لە نەوزاد ژیرترە.

٣. ئەڤ گوڵە ژ گولادی سۆرترە.

٤. نەسرین ژ زینێ جوانترە.

٥. كتێبا من ژ كتێبا تە كەڤنتربوو.

پ/

١. ئازا زیرەكترین قوتابییە لەم پۆلەدا.

٢. هەڵگود بڵندترین چیایە لە كوردستانی باشووردا.

٣. بەختیار قوتابیی هەرە زیرەكی ئەم قوتابخانەیە.

٤. دلۆڤان ژ هەمیا مەزنترە.

٥. ئازاد لە گشت خوێندكاران باشترە.

٦. نەرمین لە هەموو خوێندكاران هێمنترە.

## خستنه ڕوو:

ئـ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (ئـ) دەکەین، دەبینین وشەکانی هێڵیان بەژێرەوەیە {ناسك، سارد، گەش، تێگەیشتوو، شیرین} هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و هەر یەکەیان ڕێکاو ڕێك بۆ وەسفی ناوێك یان جێناوێك، یاخود بۆ تەواوکردنی کاری ناتەواو بەکارهێنراون، لێرەدا هاوەڵناوەکە لە پلەی چەسپاو دایە.

ب- ئەگەر سەرنج بدەینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین وشەکانی هێلیان بەژێرەوەیە {زیرەکتر، ژیرتر، سوورتر، جوانتر، کەڤنتر}. هەموویان هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و لە پلەی بەراوردان چونکە هەریەکەیان بۆ بەراوردکردن لەنێوان دوو ناوی وەسفکراو بەکارهێنراوە کە هەردووکیان هاوبەشن لە سیفەتەکە کە بەلام پلەی یەکێکیان پترە لەوی تر. بە دانانی پاشگری (تر) لە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنیەتی دروست دەکرێت‌و ئامرازی پەیوەندی {لە، ژ} دەکەوێتە نێوان هەر دوو ناو.

پ- کاتێ سەیری ڕستەکانی بەشی (پ) دەکەین، دەبینین وشەکانی هێلیان بە ژێرەوەیە {زیرەکترین، بڵندترین، هەرە زیرەك، ژ هەمیا مەزنتر، لە گشت خوێندکاران باشترە، لە هەموو خوێندکاران هێمنتر}. هاوەڵناوی چۆنیەتین‌و لە پلەی بالادان، چونکە هەر یەکەیان ئەندازەی بالایی ناوێك نیشان دەدات لەنێوان ئەو ناوانەی کە هەموویان هاوبەشن لە سیفەتەکە بەلام پلەی یەکێکیان لە هەموویان پترە. بە دانانی پاشگری (ترین) لە کۆتایی هاوەڵناوی

چۆنیەتی دروست دەکرێت. هەروەها دەتوانرێ بەهۆی وشەی (هەرە) یا (ژهەمیا)یا (لە گشت) یا (لە هەموو) پلەی باڵا دروست بکرێت کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی بەراورد یا چەسپاو.

## دەستوور:

**هاوەڵناوی چۆنیەتی سێ پلەی هەیە:**

**ئـ- پلەی چەسپاو:** ئەو هاوەڵناوەیە کە بۆ وەسفی ناوێك یا جێناوێك بەکاردەهێنرێ و ئامرازی دانە پاڵ دەخرێتە نێوانیان.

**ب- پلەی بەراورد:** ئەو هاوەڵناوەیە کە بۆ بەراوردکردن لەنێوان دوو ناوی وەسف کراو بەکاردەهێنرێ، کە هەردووکیان هاوبەشن لە سیفەتەکە بەڵام پلەی یەکێکیان، پترە لەوی تر. پاشگری (تر) دەخرێتە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنیەتی و ئامرازی پەیوەندی {لە، ژ} دەخرێتە نێوان هەردوو ناوی بەراوردکراو.

**پ- پلەی باڵا:** ئەو هاوەڵناوەیە کە ئەندازەی باڵای ناوێك نیشان دەدات لەنێوان کۆمەڵە ناوێك کە هەموویان هاوبەشن لە سیفەتەکە، بەڵام پلەی یەکێکیان لە هەموویان پترە. بە دانانی پاشگری (ترین) لە کۆتایی هاوەڵناوی چۆنیەتی دروست دەکرێت. هەروەها دەتوانرێ بەهۆی وشەی (هەرە) کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی چەسپاو دروست بکرێت. یا بە یارمەتی وشەی { ژ هەمیا، لە گشت، لە هەموو، ژ تەڤ } کە دەخرێتە پێش هاوەڵناوی پلەی بەراورد دروست بکرێت.

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵناوی چۆنیەتی دەربهێنەو پلەکانیان دیار بخە:

١. پیاوی ئازا چاو نەترسە.

٢. سەردار ژ نەوزادی خۆشمێرترە.

٣. شاسوار باشترین قوتابیی‌یە لەم پۆلەدا.

٤. ئەڤ گولە ژ هەمیا جوانترە.

٥. ئەڤین لە گشت خوێندکاران زیرەکترە.

٦. شێرۆ ژ میرانی مەزنتر بوو.

## ڕاهێنانی (٢)

چۆن هاوەڵناوی پلەی بەراورد لە هاوەڵناوی پلەی باڵا جیا دەکەیتەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنانی (٣)

لەم دێڕە هۆنراوانەدا هاوەڵناوی چۆنیەتی دەربهێنەو پلەکانیان دیاربخە:

١. مەڵێ برژانگت تیژە وەك چقڵ
ئەچەقێتە پێ ناسکتر لە گوڵ (بێسارانی)

٢. جوانتر له ژین جووتێ چاوه

هەروەك گۆمی مەنگ وەستاوە (کامەران موکری)

٣. گەلێك شیرینتر له خونچەی بەهار

ناسکتر، جوانتر له شەوبۆی نزار

گەشتر له دیدەی وەنەوشەی نزار

گوڵێکه ناوی گوڵی سەربەستی

مەردە ئەو گەلەی بگاتە دەستی (بەختیار زێوەر)

(وانەی یازدەهەم)

# هاوەڵناوی نیشانە

ئـ-

١. ئەم گوڵە جوانە.

٢. ئەو گوڵە جوانە.

٣. ئەم دارانە بەرزن.

٤. ئەو دارانە بەرزن.

٥. ئەڤ کوڕەیێ زیرەکە.

٦. ڤی خورتی سەرێ مە بلندکر.

٧. ڤێ کچێ هۆزانەك ڤەهاند.

٨. وی جامێری هاریکاریا مە کر.

٩. وێ گۆتنێ دلێ مە خۆش کر.

١٠. ئەڤان مرۆڤان نان خوارد.

١١. وان جوتیاران زەڤیێن خۆ کێلان.

ب-

١. ئەم دێیە گەورەیە.

٢. ئەو دێیانە گەورەن.

٣. ئەم کەیبانووە خاوێنە.

٤. ئەو کەیبانووانە خاوێنن.

**خستنه ڕوو:**

ئـ- كـاتێ سـەيری ڕسـتەكانی سـەرەوە دەكـەين، دەبيـنين وشـەكانی {ئـــەم-ە، ئـــەو- ە، ئـــەڤ - ە ، ڤـــی - ی، ڤـــێ - ێ، وی- ی، وێ- ێ، ئەڤان- ان، وان - ان} هەموويان هاوەڵناوی نيشانەن چونكە هەريەكەيان وەسفی ناوێكی كردووە بەهۆی دەستنيشانكردنەوەو جيـای كردۆتەوە لەناو هاوچەشنەكانی خۆيدا.

١. لـە ڕسـتەی يەكەمـدا هاوەڵنـاوی نيـشانەی (ئـەم- ە) بـۆ نزيـك بـەكاردێت وشـەی (گـوڵ)ی دەستنيـشانكردووەو وەكـو سـيفەتێك توانيويەتی لەناو هاوچەشنەكانی خۆيدا جيـای بكاتـەوەو بووەتـە ديارخەری ناوی (گوڵ).

٢. لـە ڕسـتەی دووەمـدا هاوەڵنـاوی نيـشانەی (ئـەو-ە) بـۆ دوور بـەكاردێت وشـەی (گـوڵ)ی دەستنيـشانكردووەو وەكـو سـيفەتێك توانيويەتی لەناو هاو چەشنەكانی خۆيدا جيای بكاتـەوەو بووەتـە ديارخەری ناوی (گوڵ).

٣. لـە ڕسـتەی سـێيەمدا هاوەڵنـاوی نيـشانەی (ئـەم- ە ) بـۆ نزيـك بەكاردێتو وشەی (داران)ی دەستنيشانكردووەو وەكـو سـيفەتێك توانيويەتی لەناو هاوچەشنەكانی خۆيدا جيـای بكاتـەوەو بووەتـە ديارخەری ناوی (داران).

٤. لـە ڕسـتەی چـوارەمدا هاوەڵنـاوی نيـشانەی (ئـەو- ە) بـۆ دوور بەكاردێتو وشەی (داران)ی دەستنيشانكردووەو وەكـو سـيفەتێك

توانیویەتی لەناو هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوەو بووەتە دیار خەری ناوی (داران).

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ئەڤ — ە ) بۆ نزیك بەکاردێت، وشەی (کوڕ)ی دەستنیشانکردووەو وەکو سیفەتێك توانیویەتی لەناو هاوچەشنەکانی خۆی جیای بکاتەوە، بووەتە دیارخەری ناوی (کوڕ).

٦. لە ڕستەی شەشەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤی— ی) بۆ ناوی نێری تاکی نزیك بەکاردێتو وشەی (خورت)ی دەستنیشانکردووە وەکو سیفەتێك توانیویەتی لە هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوە بووەتە دیارخەری ناوی (خورت).

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (ڤێ— ێ) بۆ ناوی مێی تاکی نزیك بەکاردێت، وشەی (کچ)ی دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لەناو هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوە، بووەتە دیارخەری ناوی (کچ).

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (وی— ی) بۆ ناوی نێری تاکی دوور بەکاردێت. وشەی (جامێری). دەستنیشانکردووە، وەکو سیفەتێك توانیویەتی لەناو هاوچەشنەکانی خۆیدا جیای بکاتەوە، بووەتە دیارخەری ناوی (جامێر).

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا هاوەڵناوی نیشانەی (وێ— ێ ) بۆ ناوی مێی تاکی دوور بەکاردێت، وشەی (گۆتن)ی دەستنیشانکردووە، وەکو

سـیفەتێك توانیویـەتی لـەناو هاوچەشـنەكانی خۆیـدا، جیـای بكاتەوەو بووەتە دیارخەری ناوی (گۆتن).

١٠. لە ڕستەی دەیەمدا هاوەڵنـاوی نیـشانەی (ئـەڤان – ان ) بـۆ نـاوی نێـرو مێـی كـۆی نزیـك بـەكاردێت، وشـەی (مرۆڤـان)ی دەستنیـشانكردووە وەكـو سـیفەتێك توانیویـەتی لـەناو هاوچەشنەكانی خۆیدا جیـای بكاتـەوە، بووەتـە دیارخـەری نـاوی (مرۆڤان).

١١. لە ڕستەی یازدەهەمـدا هاوەڵنـاوی نیـشانەی (وان – ان) بـۆ نـاوی نێـرو مـێی كـۆی دوور بـەكاردێت. وشـەی (جوتیـاران)ی دەستنیـشانكردووە، وەكـو سـیفەتێك توانیویـەتی لـەناو هاوچەشنەكانی خۆیدا جیـای بكاتـەوە، بووەتـە دیارخـەری نـاوی جوتیاران.

ب – لە ڕستەكانی (ب)دا وشەی (دێ، كـەیبانوو) دوو نـاون بـە پیتـی بزوێنی (ێ، وو ) كۆتاییان هـاتووە هـەروەها هاوەڵنـاوی نیـشانەكەش (ئەم... ە ) و (ئەو... ە ) بە پیتی بزوێنـی (ە) كۆتـایی هـاتووە، بـۆ ئەوەی دوو بزوێن بە دوای یەكدا نەیـەن ئـەوا پیتـە ناوبەنـدی گونجـاو دەخەینە نێوانیانەوە، ئەو كاتە بەپێی مەبەست بەكاریان دێنین:

( ئەم + دێ + یـ + ە )

( ئەو + كەیبانوو+ و+ ە )

## دەستوور:

**هاوەڵناوی نیشانە:** ئەو هاوەڵناوەیە کە وەسفی ناوێك دەکاتو بە ئاسانی لە هاوچەشنەکانی خۆی جیا دەکاتەوەو هەمیشە ناوە دەستنیشانکراوەکە دەکەوێتە نێوان هەردوو بەشی هاوەڵناوەکەوە.

**هاوەڵناوەکانی نیشانە لە زمانی کوردیدا ئەمانەن:**

| | | |
|---|---|---|
| ١. ئەم .... ە | ٢. ئەو... ە | ٣. ئەڤ ... ە |
| ٤. ڤی... ی | ٥. ڤێ ... ێ | ٦. وی ... ی |
| ٧. وێ... ێ | ٨. ئەڤان... ان | ٧. وان ... ان |

## ڕاهێنانی (١)

**نموونە :**

١. منداڵ (هەژار). ئەم منداڵە هەژارە پێویستی بە یارمەتی هەیە.

٢. دۆ (شیرین). ئەو دۆیە زۆر شیرینە.

ئەمانەی خوارەوە لەگەڵ هاوەڵناوی نیشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

{ دەرگا (پان)، پەنیر (جوان)، ئاو (سارد)، دەریا (قووڵ)، ئاگر (خۆش)، درەخت (بەرز)، بەڕوو (شیرین)، پیاو (ئازا)، کەو (گەردن بە خاڵ)}

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵناوی نیشانە دەربهێنە:

١. ئەو ڕاپۆرتانە بخوێنەوە.

٢. ڤێ دەفتەرێ بکڕە.

٣. ئەم نەمامەم چاندووە.

٤. وی هەڤالی فراڤین خوارد.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم هاوەڵناوە نیشانانەی خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

(وان– ان، ئەڤان – ان، وێ– ێ، ئەم– ە، ئەو– ە )

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

١. ئەم خانووە خۆشە.

٢. ڤێ مالێ بفرۆشە.

٣. ئەو مەڕانە دەفرۆشم.

٤. وێ کابانێ مالەکا مەزن برێڤە بر.

# جێناوی نیشانە

١. ئەمە بنووسەوە.

٢. ئەوە زیرەکە.

٣. ئەمانە چالاکانە کار دەکەن.

٤. ئەوانە دەناسم.

٥. ئەڤە هەڤالی منە.

٦. ڤی نان خواری‌یە.

٧. ڤێ نان خواری‌یە.

٨. وی چیرۆك گۆتی‌یە.

٩. وێ چیرۆك گۆتی‌یە.

١٠. ئەڤان (ڤان) گۆڤەندەکا خۆش گرێدا.

١١. (ئەوان) ڕەشبەلەك گرێدا.

١٢. وان بترسینە داکو بەس کارێ خراپ بکەن.

## خستنە ڕوو:

کاتێ سەیری ڕستەکانی سەرەوە دەکەین، دەبینین وشەکانی هێلیان بەژێرەوەیە، {ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە، ئەڤە، ڤی، ڤێ، وی، وێ، ئەڤان (ڤان)، ئەوان (وان)} هەموو جێناوی نیشانەن، چونکە هەریەکەیان جێی ناوێکی گرتۆتەوەو لەبری ئەو بەکار هاتووەو دەستنیشانی کردووە.

١. لە ڕستەی یەکەمدا جێناوی نیشانە (ئەمە) بۆ تاکی نزیك بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەستو نیشانیشی کردووە.

٢. لە ڕستەی دووەمدا جێناوی نیشانە (ئەوە) بۆ تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

٣. لە ڕستەی سێیەمدا جێناوی نیشانە (ئەمانە) بۆ کۆی نزیك بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردوون.

٤. لە ڕستەی چوارەمدا جێناوی نیشانە (ئەوانە) بۆ کۆی دوور بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردوون.

٥. لە ڕستەی پێنجەمدا جێناوی نیشانە (ئەڤە) بۆ تاکی نزیك بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

٦. لە ڕستەی شەشەمدا جێناوی نیشانەی (ڤی) بۆ نێری تاکی نزیك بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

٧. لە ڕستەی حەوتەمدا جێناوی (ڤێ) بۆ مێی تاکی نزیك بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

٨. لە ڕستەی هەشتەمدا جێناوی نیشانە (وی) بۆ نێری تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

٩. لە ڕستەی نۆیەمدا جێناوی نیشانە (وێ) بۆ مێی تاکی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردووە.

١٠. لە ڕستەی دەیەمدا جێناوی نیشانە (ئەڤان– ڤان) بۆ نێرو مێی کۆی نزیک بەکارهاتووە، جێی چەند ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردوون.

١١. لە ڕستەی یانزەیەمدا جێناوی نیشانە (ئەوان– وان) بۆ نێرو مێی کۆی دوور بەکارهاتووە، جێی ناوێکی گرتۆتەوەو دەست نیشانیشی کردوون.

**دەستوور:**

**جێناوی نیشانە وشەیەکە جێی ناوێك دەگرێتو لە بری ئەو بەکاردێتو دەست نیشانیشی دەکات، (ئەمە، ئەوە، ئەمانە، ئەوانە، ئەڤە، ڤی، ڤێ، وێ، ئەڤان، وان ).**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا جێناوی نیشانە دەربهێنە:

١. ئەوەیان هەڵبژاردووە.

٢. ئەمەم بۆ بهێنە.

٣. ئەڤە سەیدایێ مەیە.

٤. ئەوانە زیرەکن.

٥. ڤی نڤیسییە.

٦. ڤان زەڤیێن خۆ کێلان.

## ڕاهێنانی (٢)

### شیکردنەوە (شلۆڤە کردن)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. ئەمە هات بوو بۆ قوتابخانە.

٢. ڤی گەنم چاندی‌یە.

٣. ئەڤان ستران گۆتن‌و وان لێ ڤەگێڕا.

٤. ئەڤە تالن، ئەڤە شرینن.

## ڕاهێنانی (٣)

شەش ڕستە بهێنەوە کە جێناوی نیشانەی تێدا بێت، سێیانیان بۆ نزیک‌و سێیانیان بۆ دوور بێت.

# جیاوازی
## هاوەڵناوی نیشانەو جێناوی نیشانە

ئـ /

١. ئەم خوێندکارە هۆنراوەکەی لەبەر کردووە.

٢. ئەڤ ڕەزە یێ مەیە.

٣. ئەو نەمامانە بچێنە.

٤. ڤیێ زەڤیێ بەرهەمەك باش هەیە.

٥. ئەڤان گولان بچینە.

٦. وی ڕەزڤانی ڕەزێ خۆ فرۆت.

٧. ڤیێ قوتابیێ وانە باش خواند.

ب /

١. ئەمە کتێبەکەی هێنا.

٢. ئەوانە کارەکەیان تەواوکرد.

٣. ئەڤە بوو شەڤێ دی هاتە مالاوە.

٤. ڤی گول چاندی‌یە.

٥. ڤیێ کراسەك کڕی‌یە.

٦. ئەڤان پارە وەرگرت.

٧. وان فراڤین خواردبوو.

## خستنە ڕوو:

ئـ- پێشتر زانیمان کە هاوەڵناوی نیشانە وشەیەکە ناوێك دەست نیشان دەکات وەکو سیفەتێك دەبێتە دیارخەری ناوەکە. ئەمجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (أ) بکەین، دەبینین کە هاوەڵناوی نیشانە (ئەم-ە، ئەڤ - ە، ئەو- ە، ڤیٚ- یٚ، ویٚ- ی، ئەڤان- ان ). هەر یەکەیان ناوێکی دەست نیشان کردووەو بووەتە دەرخەری ناوەکە. ناوە دیارخراوەکە (دەست نیشان کراو) کەوتۆتە نێوان هەردوو کەرتی هاوەڵناوی نیشانە.

ب- لەمەو پێش زانیمان کە جێناوی نیشانە وشەیەکە جێی ناوێك دەگرێتو ناوەکەش دەست نیشان دەکات. ئینجا ئەگەر سەیری ڕستەکانی بەشی (ب) بکەین، دەبینین جێناوی نیشانە (ئەمە، ئەوانە، ئەڤە، ئەڤە، ڤی، ڤیٚ، ئەڤان، وان). هەر یەکەیان جێی ناوێکی گرتووەو لەبری ئەو بەکارهاتووەو دەست نیشانیشی کردووە.

## دەستوور:

**جیاکردنەوەی هاوەڵناوی نیشانەو جێناوی نیشانە لە یەکتری بەم شێوە دەبێت.**

**١. هاوەڵناوی نیشانە وشەکە دوو کەرتە، ناوێك دەکەوێتە نێوانیان، بەڵام جێناوی نیشانە وشەکە وەکو خۆی یەك پارچەیەو شوێنی ناوێك دەگرێتەوە.**

**٢. ناوی دەست نیشان کراوە لە هاوەڵناوی نیشانە باس دەکرێتو دەکەوێتە نێوان هەردوو کەرتییەوە، بەڵام لە جێناوی نیشانەدا ناوی دەست نیشانکراو باس ناکرێت.**

**٣. هاوەڵناوی نیشانە لە پاڵ ناوێك دێتو دەبێتە دیارخەری بەڵام جێناوی نیشانە جێی ناوێك دەگرێتو لە بری ئەو بەکاردێت.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا وشەی نیشانە هەیە کامیان هاوەڵناوی نیشانەیەو کامیان جێناوی نیشانەیە؟ دیاریان بخە.

١. ئەڤە وارێ مەیە.

٢. ئەم کتێبەم نەخوێندۆتەوە.

٣. ئەوانە مێوانەکانن.

٤. ڤی خەباتکەری خەلات بکە.

٥. کولیکێن ناڤ وان ڕەزا، جوانن.

٦. کەی ئەمە تەواو دەکەیت؟

٧. ڤان شڤانان پەزێ خۆ ئاڤدا.

٨. ڤێ زەڤی فرۆتی یە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە بە مەرجێك جارێك هاوەڵناوی نیشانەبن‌و جارێك جێناوی نیشانە بن.

{ وی، وان، ڤان، ویٚ، ڤی }

## ڕاهێنانی (٣)

### شیکردنەوە (شلۆڤە کردن)

ئەم ڕستانەی خوارەوە شی بکەوە:

١. ویٚ نامەییٚ بنڤیسە.

٢. ئەمە کاغەزەکەی هێنا.

٣. ئەڤان چیرۆك نڤیسان چیرۆك نڤیسی.

٤. ئەوانە بۆ من دابنیٚ.

## ڕاهێنانی (٤)

چۆن هاوەڵناوی نیشانە لە جێناوی نیشانە جیا دەکەیتەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

# هاوەڵکار

١. دوهی بەفر باری.

٢. دەرسەکەمان خێرا تەواو بوو.

٣. ئازادی کەو دناڤ هێلینێ داگرت.

٤. پووشەکە تۆزێ سووتا.

## خستنە ڕوو:

ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین‌و لە کارەکانیان باش ورد ببینەوە دەبینین:

- لە ڕستەی یەکەمدا دەمانتوانی (مەدشیا) بێژین (بەفرباری) بەڵام بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ دەمی ڕوودانی کاری ڕستەکە دابنێین پەیڤی (دوهی)مان بەکارهێناوە بەهۆیەوە توانیمان ڕوودانی کارەکەو ڕامانەکە ژی بە تەواوی ئاشکرا بکەین.
- لە ڕستەی دووەمدا مەڤیا چەوانییا وێ تەواوبوونێ دەربخەین لەبەر ئەوە پەنامان بردە بەر پەیڤی (خێرا)وە سنوورێکمان بۆ واتای کارەکە دانا.
- لە ڕستەی سێیەمدا ویستومانە شوێنی ڕوودانی کارەکە کە گرتنەکەیە پیشان بدەین بۆیە هاتووین هاوەڵکاری (دناڤ هێلینێ)مان بەکارهێناوە کە بەهۆیەوە سنوورێکمان بۆ

واتای کارەکە داناو زانیمان کە ئازاد کەوەکەی لەناو هێلانەکەدا گرتووە.

- لە ڕستەی چوارەمدا پەیڤی (تۆزێ) هاوەڵکارە چونکە وەسفی (پەسنی) کاری (سووتا)ی کردووە، چەندییە چونکە ئەندازەی سووتانی پووشەکەی بۆ دەرخستووین، ئەگەر ئەم پەیڤە لە ڕستەکەدا نەبووایە نەمان دەزانی (مەنەدزانی) کە پووشەکە چەند سووتاوە، لەبەر ئەوە بەم پەیڤە دەگوترێت (هاوەڵکاری چەندی).

## دەستوور:

**هاوەڵکار/ پەیڤەکە ڕوویەکی ڕوودانی کاری ڕستە دەربارەی (چۆنیەتی ئەو ڕوودانە، یان کاتی، یان شوێنی، یان چەندیی) دەردەخاتو لەم ڕووەوە سنوورێك بۆ تەواوکردنی واتاکەی (ڕامانەکەی) دادەنێت.**

# جۆرەکانی هاوەڵکار

## ١ ) هاوەڵکاری کاتی

١. ئەمشەو نامەیەك بۆ هەڤاڵەکەم دەنووسم.

٢. دوهی جووتیاری گەنم جەنجەر کرد.

٣. لەمەولا ڕژێمی دەرەبەگ نامێنێت.

٤. ئەمڕۆ گەلانی جیهان بۆ ئاشتی تێدەکۆشن.

٥. ساڵەکا دی پەیمان دێ چێتە زانکۆ.

٦. ئەوان ئێستا نانەکەیان دەخۆن.

٧. بەزستان پینەو پەڕۆ، بە هاوینان ورد ورد بڕۆ.

## ٢ ) هاوەڵکاری شوێنی

١. منداڵەکە لەسەربان نووست.

٢. مەلەڤان دناڤ ئاڤێدا بوو.

٣. پشیلەکە لە قوژبنی ژوورەکەدا هەڵتووتابوو.

٤. قوتابی لەبن دارێ دخوێنیت.

٥. ئاکام لە تەنیشت منەوە وەستابوو.

## ٣ ) هاوەڵکاری چۆنیەتی ( چۆنی )

١. پیاوەکە دەرگاکەی توند پێوەدا.

٢. ڕووداوەکەی لەسەرخۆ گێڕایەوە.

٣. نازدار بلەز چوو قوتابخانێ.

٤. مامۆستا بە پێکەنینەوە هاتە ژوورەوە.

٥. فراڤینی ب گەرمی بخۆ.

٦. ڕۆژنامەکەی بە خۆڕایی هێناوە.

## خستنه روو:

١. له زنجیره ڕستهكانی بهشی (١)دا هاوه‌ڵكاری (ئه‌مشه‌و، دوهی، لەمەولا، ئەمڕۆ، ساڵەكا دی، ئێستا، بە زستان، بە هاوینان) هەریەكەیان سنوورێك بۆ ڕوودانی كارەكەی دادەنێتو لەم ڕووەوە دەبنە تەواوكەری كارەكان. جا بەو وشەیەی كە كاتی ڕوودانی كاری ڕستەكە دەردەخاتو واتاكەشی تەواو دەكات دەوترێت (هاوەڵكاری كاتی).

٢. له زنجیره ڕستهكانی بهشی (٢)دا هاوه‌ڵكاری (لەسەربان، دناڤ ئاڤێدا، لە قوژبنی ژوورەكەدا، لەبن داریٚ، لە تەنیشت) هەر یەكەیان سنوورێك بۆ ڕوودانی واتای كارەكان دادەنێتو لەم ڕووەوە دەبنە تەواوكەری كارەكان، جا ئەو وشەیەی كە شوێنی ڕوودانی كاری ڕستەكە دەردەخاتو واتاكەشی تەواو دەكات، دەوترێت (هاوەڵكاری شوێنی).

٣. له زنجیره ڕستهكانی بهشی (٣)دا ئاوه‌ڵكاری (توند، لەسەرخۆ، بلەز، بە پێكەنینەوە، بە گەرمی، بە خۆڕایی) هەر یەكەیان سنوورێك بۆ ڕوودانی واتای كارەكان دادەنێتو لەم ڕووەوە دەبنە تەواوكەری كارەكان. جا بەو وشەیە كە چۆنیەتی ڕوودانی كاری ڕستەكە دەردەخاتو واتاكەشی تەواو دەكات دەوترێت (هاوەڵكاری چۆنیەتی).

## دەستوور:

١. هاوەڵکاری کاتی: وشەیەکە (یان چەند وشەیەکە) کاتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە بۆ نموونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵکاری کاتن.

(دوێنێ، پێرێ، ڕۆژی هەینی، مانگی گوڵان، نەهۆ (ئێستا)، لەمەوپێش، پارشێو، ئێوارە، ئەمساڵ... ).

٢. هاوەڵکاری شوێنی: وشەیەکە (یان چەند وشەیەکە) شوێنی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە. بۆ نموونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵناوی شوێنن.

(خوار، تەنیشت، لەژێر، بەردەم، ڕاست، چەپ.... ).

٣. هاوەڵکاری چۆنیەتی: وشەیەکە (یا چەند وشەیەکە) چۆنیەتی ڕوودانی کاری ڕستەکە دەردەخاتو دەبێتە تەواوکەری کارەکە، بۆ نموونە ئەمانەی خوارەوە هاوەڵکاری چۆنیەتین.

(خێرا، هێدی، بە گوڕ، توند، لەسەرخۆ، بە ژیری، بە چاکی، بە پەلە، بە نازداری، بە هێمنی، ب ساردی، ب خۆشی....).

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی خوارەوەدا هاوەڵکاری (کاتی، شوێنی، چۆنیەتی) دیار بکە:

١. لەمێژە گەلی کورد دژی داگیرکەر وەستاوە.

٢. خوناڤ ب سەرفرازی ژ ئەزموونێ دەرباز بوو.

٣. کتێبەکەم لەناو جانتاکەدا دانا.

٤. بەهاوین زۆربەی خەڵك لەسەربان دنڤن.

٥. ئەڤرۆ دڤێت کوردستان ژ هەموو لایاڤە پێش بکەڤیت.

٦. ڕۆژانی هەینی دەچن بۆ سەیران.

٧. ژوورەکەی لەسەر پشت بەجێ هێشتووە.

٨. کچەکەیان بە هێمنی کارەکانی ڕادەپەڕێنێت.

٩. باران بەخوڕ دەبارێت.

١٠. دوێنێ هاتم بۆ لات، لە ماڵ نەبوویت.

١١. ئۆتۆمبیلەکە بەگوڕ بە لاماندا تێپەڕی.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم هاوەڵکارانەی خوارەوە چ جۆرێکن، لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

(لەناو باخەکەدا، پار، بە جوانی، هەفتەی داهاتوو، باش، بەربانگ، پیاوانە، لەژێر درەختەکە).

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە هاوەڵکار پڕ بکەرەوە:

(لە......... شاری بەغداوە بە ......... سەعاتی ڕێك بە ئۆتۆمبێل دەگەینە بابل، ئەو شارەی پێنج هەزار ساڵ ......... دروستکراوە، پاشاکەی ......... لەدایکبوونی عیسا بە حەڤدە سەدە پەیڕەوێکی ڕێك و پێکی داناوە، ......... حامورابیدا، بابل خاوەن هێزو دەسەڵاتێکی مەزن بووە).

## ڕاهێنانی (٤)

١. ڕۆژنامەکەم بە پاڵکەوتنەوە خوێندەوە.

ڕۆژنامەکە: ناوە- تاکە، گشتییە، ناسراوە، بەرکارە.

م : جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی تاك بکەرە.

بە پاڵکەوتنەوە: هاوەڵکاری چۆنیەتییە، تەواوکەری کاری ڕستەکەیە.

خوێندەوە : کاری ڕابوردووی تەواوی تێپەڕە.

٢. ئەم ڕستانەی خوارەوە شیبکەوە:

ئـ- گەلی کوردستان لە پێنجی ئاداردا شێرانە ڕاپەڕی.

ب-دوێنی چووم بۆ ماڵی هاوڕێکەم.

# گرێی ناوی

ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. چرای ژوورەکەم کوژاندەوە. (بەرکارە)

٢. چرای ژوورەکەمان ڕووناکە. (نیهادە)

٣. چرای ژوورەکە داگیرساوە. (بکەرە)

٤. ڕووناکیمان لە چرای ژوورەکەوە بۆ دێت. (تەواوکەری بەیاریدەیە)

٥. چرای ژوورەکەی ئازاد ئەو ناوەی ڕووناك کردۆتەوە. (تەواوکراوە بەناو)

٦. ئەوە ڕووناکی چرای ژوورەکەیە. (تەواوکەری کاری بێ هێزە)

٧. من چرایێ ژوورا خۆ ڤەمراند. (بەرکارە)

٨. کەوێ روباد یێ دەنگ خۆشە. (نیهادە)

٩. دارا گویزێ زۆر ئاڤ دڤێت. (بکەرە)

١٠. ئاگر ژ دەهمانا مرۆڤی بەر دبیتە مرۆڤی. (تەواوکەری بە یاریدەیە)

١١. دەلنگێن شەلێ میرزای دگورجن. (تەواوکراوە بە ناو)

١٢. لۆمەکردن دەرازینکا دەری یە. (تەواوکەری کاری بێ هێزە)

١٣. تیشکی چرای ژوورەکە کزبوو. (تەواوکەری ناوە)

## خستنە ڕوو:

لە خوێندنی سالانی پێشوودا، زانیمان کە هەر کۆمەڵە پەیڤێك ئەگەر بەسەر یەکەوە بن‌و کاریان دگەڵ نەبێت‌و مەبەست‌و ڕامانەکا تەواو بە دەستەوە نەدەن، ئەوا پێیان دەگوترێت (گرێ)، جا ئەگەر بڕۆنینە ڕستەکانی سەرەوە، دەبینین:

ئـ- له ڕستەی یەکەمدا، گرێی تـەواو کراوی (چـرای ژوورەکـە) کەوتۆتـە بەر کارێگەریی کـاری تێپـەڕی (کوژاندەوە)و بـووە بـە بـەرکار، ئـەو گرێیە وەکو ناوێکی ئاسایی کار دەکا، بۆیەش پێی دەگوترێت (گرێی ناوی) لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵە پەیڤێکی بەسەر یەکەوە پێکهاتووەو یەك لە ئەرکـەکانی ناویشی بینیـوە کـە بـەرکارە هـەر ب ڤـی ئـاوای دڕستا هەفتێدا (چرای ژوورا) دبیتە (گرێی ناوی).

ب- هەر بەو شێوەیە لە ڕستەی دووەمدا، هەر ئەو گـرێ تـەواو کـراوەی (چرای ژوورەکە) ئەرکێکی تـری پـێ هاتیـە سـپاردن‌و وەکـو نـاوێکی ئاسایی کارەکەی لە ڕستەدا بینیوە کە ئەرکی (نیهادە).

ب ڤی ڕەنگی گرێیا (کەوێ روباد) ژی ئەرکێ (نیهاد)ی دیتیە.

پ- لـە ڕسـتـەی سـێیەمدا (چـرای ژوورەکـە)و لـە ڕسـتـەی نۆیەمـدا (دارا گـویزێ) گرێیـەکی تـەواو کـراوە وەکـو هـەر نـاوێکی ئاسـایی (ئەرکی بکەر)ی بینیوە، بۆیە پێی دەگوترێت (گرێی ناوی).

ت- بەم جۆرە لە ڕستەکانی چوارەم‌و پێنجەم‌و شەشـەمدا، گرێـی تـەواو کـراوی (چـرای ژوورەکـە) لـە هـەر ڕسـتـەیەکدا ئـەرکێکی جیـاوازی بینیـوە، لـە ڕسـتـەی چـوارەمدا بووەتـە تەواوکـەری بـە یاریدەو لـە ڕسـتـەی پێنجەمیـشدا تـەواوکراوە بـە نـاوو لـە شەشەمیـشدا بووەتـە تەواوکەری کاری بێ هێز، دیارە ئەو سێ ئەرکەش، هەر ئـەرکی نـاون بۆیە دەبنە (گرێی ناوی).

هەر ب ڤی ئاوای گرێیێن: (دەهمانا مرۆڤی) تەواوکـەرێ ب یاریـدەو، (دەلنگـێن شـەڵی) تـەواو کرایـە ب نـاڤی‌و، (درازینکـا دەری)

تەواوکەرێ کارێ بێ هێزە، لە ڕستەی سێزدەمیشدا گرێی (چرای ژوورەکە) دەبێتە تەواوکەری ناوی تیشك.

## دەستوور:

**گرێی ناوی، کۆمەڵێك پەیڤن، بەسەر یەکەوە، پەیوەندییێکی بەهێزیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە و هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینین، هەر لەبەر ئەمەش پێی دەگوترێت گرێی ناوی.**

**لە ڕووی دروستبوونیشەوە، تەواوکراوو لێکدراوی هەیە، کە بەم جۆرە دروست دەبن:**

**١. لە دوو ناو (سادەو نادە) کە دەخرێنە پاڵ یەکترییەوە بەهۆی ئامرازی دانە پاڵەوە دەبنە گرێی ناوی تەواوکراو، وەك:**

**گوڵی باخەکە، دارا هنارێ، درەختی دارستانەکە، گۆپاڵێ گاڤانی.**

**٢. لە ناوێك و هاوەڵناوێکی سادە یان نادە کە بەهۆی ئامرازی دانە پاڵەوە دەخرێنە پاڵ یەکتری و دەبنە گرێی ناوی لێکدراو، وەك:**

**پەڕۆکە کۆنەکە، هەنارە مێخۆشەکە، چیایێ بلند، ئاڤا ڕەنگ شێلی.**

**٣. لە دوو ناو کە بەهۆی ئامرازی خستنە پاڵ و ئامرازی (بە)، (ب)، (بێ) لێکبدرێن، ئەو کاتەش دەبنە گرێی ناوی لێکدراو، وەك:**

**نانە بەڕۆنەکە، پێشمەرگێ ب جەرگ، چێشتە بە تامەکە، دارا بێ بەر.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم پارچەیەدا گرێی ناوی دەربهێنە:

شەوی زستان ناخۆشترین کات بوو لەلای ئەم دایکە هەژارە، خۆیو منداڵێکی ساوا لە ئامێزی تەنیایی شەوگاردا، سەرگەردان تا بەرەبەیان، ئەگەر بۆ ساتێکی کەمیش چاوی بچووایە خەو، خەونی بە گوندە ڕووخاوەکەیانو چیا بڵندەکانو بەفری کوێستانو گوڵە ژاڵەکەوە ئەبینی.

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەدا گرێ ناوییەکان دەستنیشان بکە:

١. خوێندکاری زیرەك خۆشەویستە.

٢. تەختەی ڕەش دەستمان پیس دەکات.

٣. ئەوان خانووە خۆشەکەیان فرۆشت.

٤. ترێ وشکەکە ناخۆشە.

٥. کەوی کوێستان لە بەفریشدا ئەژی.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانە بە گرێی ناوی پڕ بکەرەوە:

١. ........... ترسناکە.

٢. ........... نە خواردەوە.

٣. نامەیەکم بە ........... ڕەوانەکرد.

٤. ........... لە هیچ سڵ ناکاتەوە.

٥. ........... بە یەکەم دەرچوو.

# گریێ هاوەڵکاری

## ئەم پارچە نووسینە بخوێنەوە:

**ڕۆژی هەینی خۆم و هەڤالانم، چووین بۆ زەماوەندو گۆڤەندی ئاری برادەرمان، ئاری پارنا پێرار زانکۆی تەواوکردو بووە ئەندازیاری بیناسازی لە وەزارەتی ئاوەدانکردنەوەی هەرێمی کوردستان، نهۆژی سەر گەرمیێ کارو ئیشیێ خۆیەو ب دڵسۆزی ل بواری پسپۆڕیا خۆدا کار دکەت.**

**گۆڤەندەکە لە ڕۆژێکی خۆش و لە سەیرانگەهێکی بناری چیای سەفین سازکرا. زەماوەند گێڕان، پۆل پۆل ڕوویان کردە شوێنەکە، لەوێدا هەموویان بە دڵخۆشی و بە گەرمییەوە لە لایەن ئاری یەوە پێشوازی دەکران. جهێن تایبەتی بۆ وان ل بن دارو درەختێن سەیرانگەهێ هاتبوونە چێکرن. دوای ئەوەی ئاهەنگ گێڕان خڕبوونەوە، ئەڤجا شایی و گۆڤەندو هەڵپەڕکێ دەستی پێکرد کەماوەی سێ کاتژمێری خایاند، پشتی کو شەهیانەو گۆڤەند ب دیماهی هات، هەر ئێك ژ ئاهەنگ گێڕان ڤەگەڕیا بۆ جهێ خۆ.**

## خستنە ڕوو:

پارچە نووسینی سەرەوە، بەشێوەیەکی ساکار باسی زەماوەندی ئاری دەکات، کە تیایدا هەندێك دەستەواژەمان بەکارهێناوە وەك (گرێ) بۆ ئەوەی وەسفی کاری پێ بکەین بۆ نموونە:

١. له ڕستەی (ئاری پار نا پێرار زانکۆی تەواو کردو بووە ئەندازیاری بیناسازی)، دەستەواژەی (پار نا پێرار) مان بۆ وەسفکردنی کاری ڕستەکە بەکارهێناوە، ئەو دەستەواژەیە سنوورێکی بۆ ڕوونکردنەوەی واتای کارەکە داناوە، چونکە کاتی تەواو کردنەکەمان پێ دەڵێت بۆیە پێی دەگوترێت (گرێی هاوەڵکار).

٢. هەروەها لە ڕستەی (زەماوەند گێڕان پۆل پۆل ڕوویان کردە شوێنەکە)، دەستەواژەی پۆل پۆل، کە بەهۆی دووبارە بوونەوە دروست بووە، وەسفی کاری ڕستەکە دەکاتو سنوورێك بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی دادەنێت، بە هۆی ئەوەو زانیمان کە زەماوەند گێڕان بە چ شێوەیێك ڕوویان کردە شوێنەکە، هەر لەبەر هندێ ئەو ژی دبیتە (گرێی هاوەڵکار).

٣. دیسا ژی ل ڕستا (لە وێدا هەموویان بە دڵخۆشیو بە گەرمییەوە لە لایەن ئارییەوە پێشوازی دەکران)، هەردوو دەستەواژەی (بە دڵخۆشی)و (بەر گەرمییەوە) وەسفی کاری (پێشوازی دەکران)، دەکەن، کە کارێکی لێکدراوە، سنوورێکیش بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی دادەنێن، چونکی بە هۆی ئەوانەوە دەزانین کە چۆن پێشوازییەك لە لایەن ئارییەوە کراوە، بۆیە ئەو ژی دبنە (گرێی هاوەڵکار).

٤. هەمدیسان لە ڕستەی (جهێن تایبەتی بۆ وان ل بن دارو درەختێن سەیرانگە هێ هاتبونە چێکرن) دا، دەستەواژەی (ل بن دارو

درەختێن) وەسفی کاری ڕستەکە دەکاتو سنوورێك بۆ واتاکەی دادەنێتو لەم ڕووەوە ئەویش دەبێتە گرێی هاوەڵکار.

## دەستوور:

**گرێی هاوەڵکاری کۆمەڵێك پەیڤی بەسەر یەکەوەن، بە تەنیا واتای تەواو نابەخشن، لە ڕستەشدا وەسفی کاری ڕستەکە دەکەنو سنوورێك بۆ ڕوونکردنەوەی واتاکەی دادەنێن، لەم ڕووەوە بە تەواوی ئەرکی هاوەڵکار دەبینین لە ڕستەداو بۆ ڕوونکردنەوەی کاتو شوێنو ژمارەو چۆنیەتی بەکار دێن.**

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانە هێڵ بەژێر گرێی هاوەڵکاریدا بهێنە:

١. بەیانی زوو بە فێنکی سواری ئۆتومبێل دەبن.

٢. لە دۆڵەکەوە دوو دوو بۆ ڕاوە بەران دەچن.

٣. لە مانگی جۆزەرداندا تاقیکردنەوە دەست پێدەکات.

٤. هەموومان بە پێ چووین بۆ خوێندنگە.

٥. بە کاتژمێرو نیوێك لە سلێمانییەوە بۆ ئۆتومبێل دەگەینە کەرکووك.

٦. منداڵەکە لەسەر کورسییەکە دانیشتووە.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە گرێی هاوەڵکاری پڕ بکەرەوە:

١. ............ سەفەر مەکە.

٢. دارا ............ نووستووە.

٣. فڕۆکەکان ............ بە ئاسماندا فڕین.

٤. ئەو ئەسپەم ............ کڕی.

٥. کاوان ............ بە یەکەم دەرچوو.

٦. ............ ڕەمەزان جەژن دێت.

٧. ............ دامەنیشە.

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ڕستانە شی بکەرەوە:

١. هەڵۆکە بەسەر بەردەکەوە نیشتبووەوە.

٢. باران بە لێزمە دەبارێت.

٣. هەفتەی پێشوو ڕۆمانەکەمان خوێندەوە.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| ↓ | | ↑ |
|---|---|---|
| ئێستاش | : | نهۆژی |
| لەلایەن | : | ژلایێ |
| پێشوازی دەکران | : | بخێر هاتنا وان دهاتەکرن |
| ئەوان | : | وان |
| کۆبوونەوە | : | خڕبوونەوە |
| خایاند | : | ڤەکێشا |
| دوای | : | پشتی |

# گـرێی هاوەڵناوی

## ئەم ڕستانە بخوێنەوە:

١. دراوسێکەمان تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگی هەیە.

٢. ئەڤ کورێ دار بدەست پسمامێ لەزگینییە.

٣. خەیاری (ئارووی) گولێ بەدەم ناسکە.

٤. کوردستان پێویستی بە لاوی تاز پێگەیشتوو هەیە.

٥. مرۆڤی خۆ فرۆش دوژمنێ میللەتێ خۆیە.

٦. پیاوی هونەر پیشە خزمەت بە کۆمەڵەکەی دەکات.

٧. کچا گولڕوو خۆ بۆ گۆڤەندێ ئامادەکر بوو.

٨. منداڵی دەست درێژ شتومەکی ناو ماڵ دەشکێنێت.

٩. کابرای یەکدەست هەست بە کەمیی دەکات.

## خستنە ڕوو:

پاش خوێندنەوەی ڕستەکانی لای سەرەوە دەبینین:

١. لـە یەکـەم ڕسـتـەداو لـەدوای نـاوی (تەلـەفزیۆن) کۆمـەڵێك پـەیڤ بەکارهاتوون کە بەیەکەوە وەسفی ناوەکە دەکەن، ئـەو ژی پـەیڤێن (ڕەنگاو ڕەنگ)ە، کە وەکـو گرێـی هاوەڵنـاوی بـەکارهاتووە، گرێیـە چونکە لە کۆمەڵە پەیڤێك پێکهاتووەو، هاوەڵناویشە چونکە وەسفی ناوەکە دەکا، بۆیە پێی دەگوترێ (گرێی هاوەڵناو)ی.

٢. هەروەها لە ڕستەی دووەمدا، لەدوای ناوی (کوڕ) کۆمەڵە پەیڤی (داربدەست) دێت کە وەکو گرێیەك وەسفی ناوی (کوڕ) دەکات بۆیە ئەو ژی دبێتە گرێیا هاوەڵناوی.

٣. لە سێیەم ڕستەدا ناوی، (خەیار= ئاروو) بەهۆی کۆمەڵە پەیڤی (گوڵ بە دەم) وەسفی کراوەو ئەم کۆمەڵە پەیڤە بووە بە گرێی هاوەڵناوی.

٤. لە ڕستەی چوارەمیشدا، هەر بەم جۆرە گرێی (تازە پێگەیشتوو) وەسفی ناوی (لاو) دەکاتو دەبێتە تەواوکەریشی، کە گرێیەکی هاوەڵناوییە.

٥. ئینجا هەر بەم جۆرە لە ڕستەکانی پێنجەم، کۆمەڵە پەیڤی (خۆ فرۆش)و لە شەشەمدا کۆمەڵە پەیڤی (هونەر پیشە)و لە حەفتەمیشدا کۆمەڵە پەیڤی (گولڕوو): لە هەشتەمیشدا کۆمەڵە پەیڤی (دەست درێژ)و لە نۆیەمدا (یەکدەست)، هەر یەکەیان لەدوای ناوێکەوە بەکارهاتوون بۆ ئەوەی بە هۆیانەوە وەسفی ناوەکەی پێ بکرێ، ببنە تەواوکەریش بۆیان، هەمووشیان وەکو گرێی هاوەڵناو لە شوێنی خۆیاندا بەکارهاتوون. ئەوەی شایانی باسە، لە هەموو ڕستەکاندا گرێ هاوەڵناوییەکان بە یارمەتی ئامرازی دانە پاڵی (ی،ی، أ، ێن، ێت، ێد ) کارەکانی خۆیانیان ئەنجام داوە، کە دەکەوێتە نێوان ناوەکەو گرێیەکە.

## دەستوور:

**گرێی هاوەڵناو کۆمەڵە پەیڤێکی بەسەریەکەوەیە کە لەڕستەدا ئەرکی هاوەڵناو دەبینێت و وەسفی ناوێک یان جێناوێک دەکات، بە یارمەتی ئامرازی دانە پاڵ. ئەم گرێ هاوەڵناوییانە بە گەلێک شێوە دروست دەکرێن.**

## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانەی خوارەوە بە گرێیەکی هاوەڵناوی پڕ بکەرەوە:

١. مرۆڤی .......... بە ئاوات دەگات.

٢. خاڵە ڕەجەب پیاوێکی .......... ی شاری سلێمانی بوو.

٣. لەگەڵ هاوڕێی .......... هەڵسوکەوت مەکە.

٤. خاتوو میتران بە دایکی .......... کورد دادەنرێت.

٥. میوەی .......... مەخۆ.

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە گرێیەکی گونجاو پڕ بکەرەوەو جۆرەکەشی بنووسە:

١. .......... ناخۆشە.

٢. کوڕە .......... ئامۆازمە.

٣. .......... دەکڕم.

٤. کاغەز .......... دروست دەکرێت.

٥. دەبێت خوێندکار ..........ت خۆش بوێت.

٦. .......... نووسی.

٧. مرۆڤ .......... دەژی.

## ڕاهێنانی (٣)

شەش ڕستە بهێنەوە بە مەرجێك لە دوو ڕستەدا گرێی ناوی هەبێتو لە ڕستەیەکی تردا گرێی هاوەڵکاری هەبێتو لە سێ ڕستەکەی تردا گرێی هاوەڵناوی هەبێت.

## ڕاهێنانی (٤)

چۆن گرێی ناویو هاوەڵناویو هاوەڵکاری لێك جیا دەکەیتەوە؟ بە نموونە ڕوونی بکەوە.

## ڕاهێنانی (٥)

لەم گرێیانەی خوارەوە جۆری گرێیەکە دیار بکەو لە ڕستەدا بەکاری بهێنە.

(دڵ بەخەم، دوێنێ شەو، کانیی چیاکە، دوو دوو، دارسێو، نیوەشەو)

## ڕاهێنانی (٦)

ئەم ڕس[illegible]ەی خوارەوە شیبکەوە:

١. کرێ[illegible]کان پاش نیوەڕۆ لە کارگەی جگەرە گەڕانەوە.

٢. کچا دلخۆش خۆ بۆ گۆڤەندێ ئامادە دکر.

## ڕاهێنانی (٧)

جیاوازیی نێوان ئەمانەی خوارەوە ئاشکرا بکە:

١. ئ- تەختە ڕەشەکەم سڕییەوە.     ب- تەختەڕەش دەستمان پیس دەکا.

٢. ئ- منداڵەکە زیرەکە.     ب- منداڵە زیرەکەکە، چاودێری پۆلە

٣. ئ- هەرمێ لاسوورە.     ب- هەرمێی لاسوور.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

ئامۆزا : پسمام (کوڕە مام)

خەیاری گوڵ بەدەم : تیتك (دەڤتگول)

تازە پێگەیشتوو : نوی ڤێڕاگە هشتی

# كاری تێنەپەڕو كاری تێپەڕ

ئـ/

١. دلێر نقست.

٢. كۆترەكە فڕی.

ب/

١. پێشمەرگە وەلاتی دپارێزیت.

٢. نەوزاد چیرۆك دەنووسێت.

## خستنە ڕوو:

١. ئەگەر بڕوانینە ڕستەكانی بەشی (ئـ) دەبینین:

- كاری (نقست– فڕی) هەر یەك ژوان خراونەتە پاڵ كەسێك یان شتێك واتە هەر یەك ژوان كارێكی هەیە.
- لە ڕستەی یەكەمدا كاری (نقست) كارێكی ڕابوردووەو بە تەنیا شیایە رامانی ڕستەكە تەواو بكاتو مەبەستی ڕستەكەش بدات بە دەستەوە.
- لە لایەكی ترەوە دەبینین ئەركی كارەكە (نقست) لە (بكەر)كەوە (دلێر) تێ ناپەڕێتە سەر كەسێك یا شتێكی تر.

• له ڕستەی دووەمیشدا ئەرکی کاری (فڕی) لە بکەری ڕستەکە تێناپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر.

جار هەر کارێك کە بەتەنیا واتای ڕستەکە تەواو بکاتو ئەرکی لە (بکەر)ی کارەکەوە تێنەپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر دبێژنێ (کاری تێنەپەڕ).

٢. ئەگەر بنێڕینە ڕستەکانی بەشی (ب) دەبینین:

لە ڕستەی یەکەمدا پەیڤی (دپارێزیت) کارەو بکەرەکەی (پێشمەرگە)یە. ئەگەر بمانگوتایە (پێشمەرگە دپارێزیت) نەمان دەزانی چی دپارێزێت؟

جا بۆ تەواوکردنی واتای ڕستەکە، کارەکە پێویستی بە تەواوکەرێك هەیە بۆ ئەوەی واتای ڕستەکە تەواو ئاشکرا بکات کە لەمەولا بەم تەواوکەرە دەبێژین (بەرکار).

هەروەها لە ڕستەی دووەمدا کاری (دەنووسێت) پێویستی بە وشەیەکی تر هەیە تاکو واتای ڕستەکە تەواو ئاشکرا بکات چونکە ئەگەر مەگۆتبا (بمانگۆتبا) (نەوزاد دەنووسێت) نەمان دەزانی چی دەنووسێت؟ لەبەر ئەمە پەیڤی (وەلات– چیرۆك) دەبێت بە بەرکار.

• لەلایەکی ترەوە دەبینین ئەرکی کارەکە کە (بکەر)ەکە پێی ڕادبیت لە خۆیەوە تێ دەپەڕێتو دەکەوێتە سەر (بەرکار)ەکە.

• جا هەر کارێك بە تەنیا لەگەڵ بکەرەکەی نەتوانێت واتاو ڕامانی ڕستەیەك تەواو ئاشکرا بکاتو پێویستی بە پەیڤێکی تر بێت بۆ ئەم تەواوکردنە. پێی دەبێژن کاری (تێپەڕ).

## دەستوور:

١. **کاری تێنەپەڕ:** ئەو کارەیە کە بە تەنیا دەتوانێت واتای ڕستەیەك تەواو بکاتو ئەرکی لە بکەری کارەکە تێناپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی تر.

٢. **کاری تێنەپەڕ بە هیچ ڕەنگێك (بەرکار)** وەرناگرێت بەڵام دەتوانێت (تەواوکەری بەیاریدە) وەربگرێت وەکو: نیوار چوو بۆ هەولێر.

٣. **کاری تێپەڕ:** ئەو کارەیە بە تەنیا لەگەڵ بکەرەکەی نەشێت واتای ڕستەیەك تەواو ئاشکرا بکات بەڵکو پێویستی بە پەیڤێکی تر هەیە بۆ ئەم تەواوکردنە، ئەم پەیڤەش ئەرکی کارەکەی دەکەوێتە سەرو دەبێتە (بەرکار). یان کاری تێپەڕ: ئەو کارەیە کە ئەرکی لە (بکەر)ی کارەکەوە تێ دەپەڕێتە سەر کەسێك یان شتێکی ترو دەبێتە تەواوکەری کارەکەو دبێژنێ (بەرکار).

٤. **کاری تێپەڕ:** ئەم کارە دەشیت (بەرکار)و (تەواوکەری بەیاریدە) وەربگرێت وەکو: جوتیار زەوی بەهەوجاڕ دەکێڵێت. لەم ڕستەیەدا پەیڤی (زەوی) بەرکارەو (هەوجاڕ) تەواوکەری بەیاریدەیە بۆ کاری (دەکێڵێت).

## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی تێپەڕ پڕ بکەوە:

١. سێوەکەم ..........

٢. ئەو پیاوە خانوو دروست ..........

٣. تە چەند کەو ..........؟

٤. ئاڤان یا جلکا ..........

٥. دارا کاڵەکە کەی ..........

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانە بە کارێکی تێنەپەڕ پڕ بکەوە:

١. مللەت ب خواندنێ ..........

٢. گیا لەسەر بنجی خۆی ..........

٣. کۆترا شێردلی ..........

٤. لە هەموو هەورێك باران ..........

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کارانە چ جۆرێکن؟ لە ڕستەدا بەکاریان بهێنە:

( نووست، کەفت، دەبارێت، بخۆ، چاند، دەنووسین، ڕژی، هات ).

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم کارانە بەڕاستی لە بۆشاییەکاندا دابنێ:

( بێنینەدی، بووە، ئاشکرایە، ناتوانێت، دەبینین، نییە )

باری ئابووری لە گەڕەکەکانی شاردا وەکو هی دیهاتەکانی ..........

چونکە ژیان سەخت .......... شتی پێویستو بابەتی داخوازی زۆر

بووە، بۆیە.......... ڕژێمی چینایەتی لە شار .......... و کەسیش

.......... بە تەنیا هەموو پێویستەکانی خۆی..........

## ڕاهێنانی (٥)

### شلۆڤەکردن (شی کردنەوە)

١. گۆرانی یەکەمان بیست.

گۆرانی یەکە: ناوە، تاکە، ناسراوە، بێ لایەنە، سادەیە بەرکاری کاری (بیست)ە.

مان: جێناوی لکاوە بۆ کەسی یەکەمی کۆ بەکاردەهێنرێت، بکەرە.

بیست: کاری ڕابووردووە، ڕووتە، تێپەڕە.

٢. ئەم ڕستانە شلۆڤە بکە:

ئـ - خشتەك شکا.

ب- شڤانی پەز چەراند.

## ڕاڤەکردنی پەیڤان:

| پەیڤ | | ڕامان |
| --- | --- | --- |
| پێویست | : | پێتڤی |
| کاری تێنەپەڕ | : | کاریٚ دەرباز نەبووی/ الفعل اللازم |
| کاری تێپەڕ | : | کاریٚ دەرباز بووی/ الفعل المتعدی |
| کاڵەك | : | گندۆر |
| گۆرانی | : | ستران |
| بیست | : | بیهست، گوهـ لیٚ بوو |
| خشت | : | کەلپیچ، کەرپووچ، طابوق |
| شیا | : | توانی |
| پەیڤ | : | وشە |
| ڕامان | : | واتا، مەبەست |
| بنێڕینە | : | سەرنج بدەینە، تەماشا بکەین، بنۆڕینە |
| ژوان | : | لەوان |
| بەرکار | : | تەواوکەری ڕاستەوخۆ |
| پیٚی دبێژن | : | پێی دەگوترێت، پێی دەڵێن |
| بێنێتە دی | : | بجهـ بینیت |
| سەخت | : | دژوار بزەحمەت |
| بنج | : | بنجو بناوان، بنەما، ڕەگ، ڕهـ |

# بەرکار

١. پشیلە گۆشت دەخوات.

٢. دارا خشت دەبڕێت.

٣. فەرهاد نووسراوەکەی خوێندەوە.

٤. نازدار نێرگز دەڕوێنێت.

## خستنە ڕوو:

ڕستە لە دوو بنچینەی سەرەکی پێکدێت کە یەکێکیان بکەرەو ئەویتریان کارە، هەرچی لەوان زیاتر بێت پێیدەوترێت (تەواوکەر)، تەواوکەریش یان بەشی بکەر تەواو دەکات، یان بەشی کار، ئەگەر سەرنجی ڕستەکانی سەرەوە بدەین، دەبینین وشەی (پشیلە، دارا، فەرهاد، نازدار) هەر یەکەیان لەو شوێنەدا بکەرە، هەروەها وشەی (دەخوات، دەبڕێت، خوێندەوە، دەڕوێنێت) هەموویان کارن.

لەم ڕستانەدا هەندێك وشەی دیکە دەمێننەوە، کە نە بکەرن و نە کارن، بەڵکو واتای کارەکانیان تەواو کردووەو ئەرکی کارەکانیشیان کەوتووەتە سەرو پێیاندەوترێت (بەرکار)، ئەو وشانەش بە پێی ڕستەکانی سەرەوە لەم خاڵانەدا دەرکەوتوون:

١. وشەی (گۆشت) واتای (دەخوات)ی پێ تەواو کراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٢. وشەی (خشت) واتای (دەبڕێت)ی پێتەواو کراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٣. وشەی (نووسراوەکە) واتای (خوێندەوە)ی پێتەواو کراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتووەتە سەر، پێیدەوترێت (بەرکار).

٤. وشەی (نێرگز) واتای (دەڕوێنێت)ی پێتەواو کراوەو ئەرکی کارەکەشی کەوتوتە سەر، پێی دەوترێت (بەرکار).

## دەستوور:

**بەرکار: وشەیەکە، کە لەڕستەدا بەشی کار تەواو دەکات و ئەرکی کارەکەشی دەکەوێتە سەرو هەمیشە لە ڕستەیەکدا هەیە کە کارەکەی تێپەڕ بێت.**

## ڕاهێنانی (١)

بەرکار لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەربهێنە:

١. گوڵەکانم ئاودا.

٢. زەوییەکە ئاوەکە هەڵدەمژێت.

٣. چۆلەکەکەت بەردا.

٤. ئەسپەکەمان بۆ نارد.

٥. خانووەکەیان بۆ ئازاد دانابوو.

٦. گورگەکەتان کوشت؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم وشانەی خوارەوە بە (بەرکار) لە ڕستەدا بەکاربهێنە:

زەوی، جل، مەڕەکە، ئێوە، خۆمان، سێو، پووش، پەپوولە، شێر.

## ڕاهێنانی (٣)

شیکردنەوە:

ئـ- هەنگ شیلەی گوڵ دەمژێت.

هەنگ: ناوە، بکەرە.

شیلە: ناوە، بەرکارە.

ی : ئامرازی خستنە سەرە.

گوڵ: ناوە، تەواوکەری ناوی (شیلە)یە.

دەمژێت: کرداری ڕانەبوردووی تێپەڕە.

ێت : جێناوی لکاوە، دەگەڕێتەوە بۆ بکەر (هەنگ).

ب- ئەم ڕستانە شی بکەرەوە:

١. پەریزاد بنێشت دەجوێت.

٢. شێرەکەمان لە دارستانەکە بینی.

٣. ئێوە دەنێرین.

### لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| خشت | : | کەرپووچ |
| هەڵدەمژێت | : | دەمژێت |
| پووش | : | پیش |

سەرچاوە: زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی دووەمی ناوەندی/ سلێمانی

# ﴿ بەشی ئەدەب ﴾

١. مفتی پێنجوینی.
٢. قەدری جان.
٣. بێکەس.
٤. ئەسیری.
٥. دڵدار.
٦. ساڵح یوسفی
٧. کاردۆخی
٨. مارف بەرزنجی
٩. ئەمین زەکی بەگ
١٠. پرۆفیسۆری کورد ( د. کامیران بەدرخان )
١١. سادق بەهائەدین
١٢. سوارەی ئیلخانی زادە.
١٣. ئەحمەد دڵزار

# موفتی پێنجوینی

ناوی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا کەریمە، لە ساڵی (١٨٨١)ز لەدێی بێستانە لە ناوچەی پێنجوین لەدایك بووە، لە تەمەنی منداڵیدا چووەتە بەر خوێندنی حوجرە، لەسەرەتادا لای باوکی خوێندوویەتی، ئینجا بەدوای خوێندندا کەوتۆتە گەڕان بەناو شارەکانی کوردستاندا وەك (پێنجوین، مەریوان، بانە، سەقز، بۆکان، مەهاباد، سەراو، سەرچاوە، بیارە).

لە کاتێکدا کە دوا قۆناغی خوێندنی دەبێت لە بیارە، بەهۆی زیرەکیو قسەرەوانییەوە، مەلای گەورەی ئەو کاتەی بیارە مامۆستا مەلا عەبدولقادر نازناوی موفتی پێ بەخشیوە، چونکە هەر لەو کاتەدا موفتی شاری سنە ناوی مەلا عەبدوڵڵای موفتی بوو ئەمیش بەهەمان یادەوە ئەم نازناوەی پێ دەبەخشرێ. لە ژیانی دا حەزی لە مەلایەتی نەکردووە، کە دەستی لە خوێندن هەڵگرتووە دوکانداریو جگەرە فرۆشتنی کردووە بە پیشەی ڕۆژانەی خۆی. لە ساڵی (١٩٤٦)ز کە کۆماری کوردستان لە مەهاباد دامەزرا، هەر چەندە نەخۆشو پەك کەوتەبوو، بەڵام خۆشەویستیی ئەم سەربەخۆییەی کۆماری کوردستان وای کرد، گەیاندییە ناو جەرگەی ئەم کۆمارە، تا بە چاوی خۆی ئاواتی چەند ساڵەی ببینێ، لەوێ چەند پارچە هۆنراوەی بۆ کۆماری کوردستان نووسیوەو لە گۆڤاری هەڵاڵە بڵاوی کردۆتەوە. لە ڕۆژی ١٩٥٢/٦/١٥ز کۆچی دوایی کردووە لە گۆڕستانی (حاجی شێخ)دا لە پێنجوین تەرمەکەی بەخاك سپێردراوە. موفتی لە کاتێکدا ئەو دیمەنە جوانانەی

کوردستانی دیوەو گەڕاوە بەناو گوڵو گوڵستانەکاندا هەوای شیعر مێشکی گرتووەو (سروش) ئیلهامی شیعری پێ بەخشیوە. هۆنراوەی موفتی زادەی بیرێکی خۆماڵیو ئێشو ئازاری تێکڕای نەتەوەکەی بووە. چاوی لە ئاسۆی ڕزگاری کوردو پێشکەوتنی باری ژیانو دۆخی کۆمەڵایەتی کوردستان بووە. وەکو نیشتمان پەروەرێك بڕوای بە ڕاپەڕینو سەرکەوتنی گەلەکەی بووە. لە هۆنراوەکانی دا هانی ئیش کردنی داوە، جووتیارو ڕەنجبەرانی کوردی لاواندۆتەوە، چووە بە گژ زۆردارانـدا، دەرەبەگایەتی ڕیسوا کردووە لە بواری بڕوا بوون بە سەربەستیو توانای ئافرەتو هێنانە کۆڕی ئیش کردنی سیاسیو پشت بەستن بە توانای ئافرەت هەمیشە ئافرەتی بۆ ئیش کردنو باوەڕ بە خۆکردن هان داوە، سەربەستی ئافرەتی بە بەردی بنچینەی گۆڕانکاری کۆمەڵ داناوە، هۆنراوەکانی لە ڕووی ڕوخسارەوە سادەو ڕەوانو بێ گرێن خوێندەوارو نەخوێندەوار تێی دەگەن. لە ساڵی (١٩٥٩)ز بەشێك لە هۆنراوەکانی چاپ کراوە بەناوی (سۆزی نیشتمان). لە ساڵی (١٩٩٠)ز هۆنراوەکانی بەناوی (دیوانی موفتی پێنجوینی) چاپ کراوە. ئەمەش نموونەیەکە لە هۆنراوەکانی:

## گەورەیەك

گەورەیەك بۆ كەس نەبێ سێبەری

خۆم بۆ بگێڕم لە دەوری سەری؟

بە وشكی بۆچی ببمە مەیتەری

وەختێ دەركەوێ هەستم لەبەری

هەر خۆی دایما هەوڵی ژیانی بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

گەورەیەك چاوی لە فەقیر نەبێ

دەربەست ژیانی جوان‌و پیر نەبێ

مێمل بە ماڵو دوژمن بە جان بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

گەورەیەك ساتێ لەژێر دەستی ئەو

ئارامم نەبێ بێ خۆراك‌و خەو

پاسەوانی بم بە ڕۆژو بە شەو

جوێن‌و شەقیش بێ بەراتەكەی ئەو

ئەگەر شۆرەتی وەك سلێمان بێ

یاخوا ئەو گەورە بەشی نەمان بێ

(پێنج دێر بۆ لەبەركردنە)

## لێکدانەوەی وشەکان:

| | | |
|---|---|---|
| مەیتەر | : | ئەو کەسەی وڵاخی گەورە بەخێو دەکات. |
| شۆرەت | : | ناوبانگ |
| مێمل | : | دوژمنی مەرگبڕی شت |
| جان | : | گیان |
| ساتێ | : | کاتێ، گاڤەکی. |
| سلێمان | : | مەبەستی سلێمان پێغەمبەرە |
| بەراتەکەی ئەو | : | چاکەی ئەو، خەلاتاوی |
| دەربەست نەبێ | : | بە تەنگییەوە نەبێ، گوهێ خۆ پێنەدات. |
| جوان | : | لاو، جحێل، گەنج. |
| ئارامم نەبێ | : | سەبرم نەبێ، سرەوتم نەبێ |

## قەدرى جان

### ١٩١١- ١٩٧٢

ناڤێ وى (عبدالقادر عزيز جان)ە ل سالا (١٩١١)ێ ل كوردستانا باكوور ل گوندێ (دێريك) ب ڕەخ بازێرێ (ماردين) ڤە ژ دايك بوويە. ل هەمان گوند دەست ب خواندنێ كريە هەتا گەهشتى يە قۆناغا (دار المعلمين) ل بازێرى (ئەزمير)ێ ب دوماهى ئينايەو بويە مامۆستا دناڤبەرا ئەسكەندەرونەو ئەنتاكيێ دا. ل سالا ١٩٣١ێ ژبەر ڕەوشا سياسى چوويە جزيرێ چەندەك ژ ژيانا خۆ ل وێرێ برە سەر پاشى چوويە ديمەشقێو ئامودەو قاميشلۆ، ل قاميشلۆ بويە مامۆستاو پاشى هاتييە ڤەگوهاستن بۆ وەزارەتا پەروەردێ ل ديمەشقێ وەكو فەرمانبەرو ل دوماهيێ بويە سەرپەرشت. هەر دڤێ قۆناغێدا دگەل نڤيسەرو ڕۆژنامە نڤيسێن ناڤدار د. كاميران بەدرخانو نورەدين زازاو جگەر خوێنو ئۆسمان سەبرى كەفتى يەكارىو دەست ب بەلا ڤكرنا كۆڤارا (هاوار) كريە. دسالا ١٩٣٦ێ دا هۆزانڤان قەدرى جان ئێكەمين هەلبەستا سەربەستى نڤيسييە و بەلاڤكريە وبڤى چەندێ دبيتە سەركێشێ كاروانێ هەلبەستا هەڤچەرخا كوردى، ئێك بوويە ژوان هۆزانڤانێن هەردەم نويكرن دتۆرێ كوردىدا كرد. ل سالا ١٩٥٥ێ دەست ژ كارێ وەزارەتا پەروەردێ بەردايە، ژيانا وى پڕ نەخۆشى بوويەو چەندين جارا كەفتييە زيندانا. ل سالا ١٩٥٧ێ دگەل شاندێ لاوێن كورد ژ سوريێ چوويە

موسكۆ ژ بۆ پشكدارى كرنێ د ڤیستەڤالا شەشێ یا لاوێن جیهانی‌دا بارزانییێ نەمر ژی دیت.

جارەكا دی ڤەگەڕیا سەركارێ میری ول سالا ١٩٧١ هاتە خانەنشین كردن ل رۆژا ١٩٧٢/٨/٩ێ دژییێ (٦١) سالییێدا كۆچی دوایی دەكات و ل گوڕستانا (خالد نەقشبەندی) ل دیمەشقێ دهێتە ڤە شارتن.

(قەدری جان)ی دوو سروود ب بارزانییێ نەمر گۆتینە لژێر ناڤێ (سەرداری كوردان بارزانی)و (شێرێ وەلات... بارزانی هات).

(قەدری جان)ی دزۆر كۆڤارو ڕۆژنامەدا هەلبەست بەلاڤكرینەو پشكداری ددانانا چەندین پەرتووكێن فێرگەهادا كریەو زۆر هۆزانێن نە چاپ كری هەنە شارەزایی د زمانێ توركی و عەرەبی و فرەنسیدا هەبوو زێدەباری زمانێ كوردی ب هەردوو زارا ڤاڤە.

## بەرهەمێن قەدری جان:

١. داستانەك ب هۆزان (ملحمة شعرية)

٢. ئەلف و بێیا كوردی.

٣. دیوانا هەلبەستا– ١٩٥٧.

٤. ڕۆمانا (شڤانێ كورد) یا عەرەبێ شەمۆ ژ فرەنسی وەرگێڕایە سەر زمانێ كوردی سالا ١٩٤٧ب تیپێن لاتینی ل بەیروتێ چاپكریە.

## لێکدانەوەو راڤەکردنی پەیڤەکان:

| | | |
|---|---|---|
| ب رەخ بازێریَ (ماردین)ڤە | : | لە نزیك شاری (ماردین)ەوە. |
| ب دوماهی ئینایە | : | تەواو کردووە، کۆتایی پیَ هێناوە |
| دناڤبەر | : | لەنێوان، لە مایەینی |
| ژ بەر ڕەوشا سیاسی | : | لەبەر بارودۆخی ڕامیاری یان سیاسی. |
| هاتیە ڤەگوهاستن | : | گواسترایەوە، گوێزراوەتەوە |
| بڤی چەندی | : | بەم ڕەنگە، بەم شێوەیە |
| هەلبەستا هەڤچەرخا کوردی | : | هەڵبەستی هاوچەرخی کوردی |
| هەردەم نویکرن دتۆری کوردیدا کرد | : | هەموو دەم (هەمیشە) نویَ کردنەوەی لە ئەدەبیاتی کوردیدا دەکرد. |
| شاندیَ لاوێن کورد | : | وەفدی لاوانی کورد |
| ژبۆ پشکداری کرنیَ | : | بۆ بەشداری کردن |
| دۆزا کوردیدا دانییاسین | : | دۆزی (مەسەلەی) کوردی پیَ ناساندن. |

## بەگێ ئاخر زەمان

(قەدری جان)

١. دۆستێ من
دوژمنێ پۆستی من
بەگێ ئاخر زەمان
ئەڤ زەمبیلا تەپێ هات
نەمە داتێ ژ ئاسمان
بەنێ وێ ڕزیيا
لە ناڤا ڕێ قەتییا
ئو... کەت
کەتە ناڤ دەریا سۆر
دەریا سۆر ژێڕا بوو گۆڕ
دەریا سۆر ژفیرعەون‌و
چەند خودێ بچووکڕا بووکەفەن.

★★ ★★ ★★

٢. مووساو موریدێن وی
هەمی
بێ پرو بێ گەمی
ژوێ دەریایێ دەرباز بوون
ژ جەورو جەفایێ خەلاس بوون
مووسا ل سەر ڕەقسی
فیرعەون ل ور فەتسی
نەمروودێ بچووك

مەب ئاگر دترسینە

پڤ مەشكا ڤالا

ئەی كەڤنارمیێ سالا

باوەڕیا دلێ مە

تاقەتا ملێ مە

ژ ئیمانا ئیبراهیم

پێترە، نەكێم ترە

ڤیا بزان

ئەی پێغمبەرێ دزان

دۆستێ من

دوژمنێ پۆستێ من

بەگێ ئاخر زەمان

ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات

نەمە داتێ ژ ئاسمان

★★ ★★ ★★

٣. مەزنا تی

نەب پارەو مالە

نەب گۆڕینا كالە

مەزنا تی

ب جەوهەرێ ئینسانە

ب عیلمو عیرفانە

بەلێ... ئەم خەزانی مالن

لێ زەنگینێ کەمالن

زەنگینێ ئیدیالین

دۆستێ من

دوژمنێ پۆستێ من

بەگێ ئاخر زەمان

ئەڤ زەمبیلا تە پێ هات

نەمە داتێ ژ ئاسمان

★★ ★★ ★★

٤. کۆشکا تەیە هیم ڤالا

یا ب نینۆ کا پالا

ئین ب خوون

ئین برین

گەلەك ڕەبەن ژ برچیتیا کوشت

تە ئاڤا کر دبندا ڕوونشت

ئەوێ ل سەر سەری تە هەلوەشە

گەر چی دلێ مە ب تە نائێشە

لێ ئەم دخازن

ب دل دبازن

زارۆیێن تەئێ بێ گونەهـ

کو ب هێژمار هەنە نەهـ دەهـ

ژوی تالووکێ خەلاس بکەن

ب رێیا ڕاست دا دەرباس بکەن

ڕێیا ڕاست، ڕێیامە

ئەوە باوەڕیا مە

زنجیر شکاندن

ئارمانج گهاندن

★★ ★★ ★★

٥. با بلیسکا بیستان

دیرۆکا ڕاستان

دبێژە

ببێژە

گوهـ مەدە ئەفسانەیێ دێوان

ب شۆندا نەمینە ژ کاروان

کاروانێ مەدەنیەت

گروهێ بەشەرییەت

خولاسە

پێشیێ و پاشیا فەلسەفە

فەلسەفە یامە

ئەڤە

دین، مەزهەب ئیمان

ببە ئینسان ببە ئینسان

★★ ★★ ★★

(کۆپلەی یەکەم لەبەردەکرێت)

## ڕاڤەکردنی پەیڤەکان:

| پەیڤ | | ڕامان |
|---|---|---|
| پۆست | : | پێست |
| ئەڤ | : | ئەو |
| زەمبیل | : | زەمبیلە، سەبەتە |
| تەپێ هات | : | تۆپێی هاتیت |
| نەمەداتێ | : | ئیتر دانابێ، ڤێجا نادادی، ئیتر نایەتە خوارەوە |
| ژ | : | لە |
| بەنێ وی | : | بەنی ئەو |
| ل ناڤارێ | : | لەناو ڕێدا |
| قەتیا | : | پچڕا |
| ناڤ | : | ناو |
| ژێڕا | : | بۆ ئەو |
| خودێ | : | خودا |
| موریدێن وی | : | موریدانی ئەو |
| پر | : | پرد |
| گەمی | : | بەلەم، کەشتی |
| ژوی | : | بۆ ئەو |
| دەرباس بوون | : | ڕزگار بوون، ڕابوردن |
| لەور | : | لەوێ |

فەتسی : تۆپی

ڕەقسی : هەڵپەڕی، سەمای کرد

مەشکا ڤالا : مەشکەی بەتاڵ

کەڤناڕە : کۆتەردار، پیرەدار

پێترە : زیاترە

نە کێم ترە : کەمتر نییە

ڤیا بزان : ئەوە بزانە

مەزناتی : گەورەیی

گۆڕین : گۆڕانی

گۆڕێن : قەبرانی، کۆی (گۆڕ) بە مانای (قەبر) دێ

کال : باپیر

خەزان : هەژار، بەڵام لە کرمانجی خوارووداوا تای پاییزە

لێ : بەڵام

ئیدیال : بیر، هزر

هیم : بناغە

ڤالا : بەتاڵ

پالا : کرێکار

ئین : ئەوانە

رەبەن : هەژار، بەسەزمان

برچێتی : برسێتی

ئاڤاکر : ئاوەدان کردەوە

| | | |
|---|---|---|
| دبندا | : | له بنیدا، لەژێریدا |
| ڕوونشت | : | دانیشتی |
| ئەوی | : | ئەو |
| دخازن | : | مەدڤێت، دەمانەوێت |
| دبازن | : | ئارەزوومانە |
| زارۆیێن تە | : | بچوکێن تە، منداڵانی تۆ |
| زارۆ | : | منداڵ |
| تالووکێ | : | تالووکە، مەترسی |
| ئارمانج | : | ئامانج |
| بابلیسك | : | سەدە |
| بابلیسکا بیستان | : | سەدەی بیستەم |
| دیرۆك | : | مێژوو، ڕابووردوو |
| بە شۆندانەمینە | : | دوامەکەوە |
| گروهـ | : | بار، کاودان، وضع: ظروف، بارودۆخ. |
| دۆز | : | کێشە: قضیة |

## ژێدەر:

١. هەفتی نامە پەیمان ژمارە (١٥٤).

٢. کتێبی زمانو ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی چاپی سێزدەهەم ساڵی ١٩٩٦.

# بێکەس

## ١٩٠٥- ١٩٤٨ز

ژیانی پڕ لەدەردەسەریو کولو کۆڤانو مشەختیو دەربەدەری بووە، هۆی ئەوە کە (فایق)ی کوڕی (عەبدوڵڵا بەگ) نازناوی (بێکەس) بۆ خۆی بکا بە ناوو خەڵکی هەر بەو ناوە بیناسین. (فایق) لە ساڵی ١٩٠٥ز لە گوندی (سیتەك) کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی سولەیمانی لە دایك بووە لە منداڵییەوە لە حوجرەی فەقێیان خوێندوویەتی. ماوەی چەند ساڵێك لە بەغدا ژیاوە، پاشان باوکی ڕوو لە تورکیا دەکا، دایکیشی دوای ئەوە هەر لەبەغدا کۆچی دوایی دەکا، بۆیێ فایق لە ساڵی ١٩١٨ز دێتەوە سولەیمانی لای مامیو لەوێ دەکەوێتە بەر خوێندن. دووبارە لە ١٩٢٤ز دەچێتەوە بەغداو دوای یەك دوو ساڵ دەگەڕێتەوە. ماوەیەك لە (ئەشغال) کار دەکاو ئنجا دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانە سەرەتاییەکان.

بێکەس شاعیرێکی کورد پەروەرو وڵات پارێز بووە، چەند جار لەبەر بزاڤی ڕامیاری تووشی گرتنو لەکار دەرکردن بووە، چاو نەترسو ئازا بووە، بەشداری ڕاپەڕینەکەی (٦)ی ئەیلولی ١٩٣٠بەر دەرکی سەرای کرد لە سولەیمانیو تیایدا بریندایش بوو، هیچ کاتێك گوێی بە پلەو پایەو پارەو پوول نەداوە، نزیك بووە لە بزاڤە ڕامیارەکانی ئەو کاتە وەك بزاڤی (ژ.ك) پاشان (پارتی دیموکراتی کوردستان). شیعرەکانی بۆ خزمەتکردنی گەلو نیشتمانەکەی تەرخان کردووە، بەشی زۆری هۆنراوەکانی باس لە کوردایەتیو نیشتمانپەروەری دەکەن، بێجگە لەوە

بابەتەکانی کۆمەڵایەتی پانتاییێکی فراوان داگیر دەکەن لە دیوانەکەی. کۆمەڵە سروودێکی زۆر خۆشی بۆ منداڵان داناوە کە سەردەمانێکی دوورو درێژ قوتابییانی سەرەتایی بە ئاوازی خۆشەوە هەموو بەیانییەك لە قوتابخانەکانیان دەیانگوت لەوانە:

**١. خوایە وەتەن ئاواکەی. ٢. شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گۆیژە**

**٣. ئەی دلێران بێچووە شێران‌و... گەلێکی تر**

لە ڕۆژی ١٩٤٨/١٢/١٨ز لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کردوو لە گۆڕستانی گردی سەیوان لە سولەیمانی بە خاکی پاکی کوردستانیان سپاردووە.

لە ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ز کاربەدەستان‌و دەسەڵاتدارانی حکومەتی عێراق چوار ئەفسەری کورد پەروەریان لە سێدارەدا، ئەوانەی بەشداریان لە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد کردبوو، چوار ئەفسەرە شەهیدە جوانە مەرگەکە ئەمانە بوون:

(عیزەت عەبدولعەزیز)، (محەمەد مەحموود قودسی)، (مستەفا خۆشناو)، (خەیروڵلا عەبدولکەریم). بێکەس ئەم پارچە هۆنراوە بە سۆزەی لە پێشوازی ئەو شەهیدانە گوتوە کە تەرمی دووانیان لە بەغداوە براوە بۆ سولەیمانی.

**١. قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین**
**میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین**

**٢. میللەتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان**
**بێتە بەر سێدارە، بێ ترس، دەم بەخەندەو پێکەنین**

لەسەردەمی ئێستاماندا تێلیڤژن یەکێکە لەو شتە پێویستیانەی کە دەستێکی بالایان هەیە لە پێش خستنی کۆمەڵو رووناك کردنەوەی رێگە ژیان.

تێلیڤژن رێگایەکی نایابی فێرکردنو بلاوکردنەوەی زانیارییەو هۆیەکی گەورەی بیر رووناك کردنو مێشك رەوشەن کردنە... گرنگی تێلیڤژن لەوەنایە کە مرۆڤ – هەموو مرۆڤێك– خوێندەوارو نەخوێندەوار دەتوانێت کەلكو سوودی لێ وەربگرێت، تەنیا گوێ گرتنو تەماشا کردن ئەم مەبەستە دەگەێنێت.

کۆمەڵەی ئێستای ئادەمیزاد، کۆمەڵێکی پڕ کارو ئیشە، زۆربەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵە، بەتایبەتی لە شارە گەورەکاندا لەگەڵ گزنگی هەتاوی هەموو رۆژێك دەست دەدەنە کارو فرمانی خۆیانو دەکەونە ناو گێژاوی ئێش کردنەوەو بەدەستو بە مێشك لە ئیشکردندا دەبن، لە ئەنجامی ئەم کارکردنەدا لەشو مێشك سستو ماندوو دەبن، لەبەر ئەوەشە ئێواران یا کاتێك کە فرمانی ئەو کەسانە کۆتایی دێت، مێشکی ماندوویان پێویستی بە خۆراك دەبێتو ناچار پەنا دەبەنە بەر تێلیڤژن، چونکە نەواو چریکەی گۆرانی بێژانو دەنگی پڕ جۆشی سازو سەمتوورو دیمەنی جوانو رەنگاو رەنگی سروشتو شاییو هەڵپەرکێی هەمە چەشنە دەبنە خۆراکی مێشکی ماندوو، مرۆڤ دەخەنە دەریایەکی مەزنی پڕ ئارامیو ئاساییشەوە.

ئەو کەسانەی کە خولیای یاریو گەمە کردنن، پا بەندی سەیر کردنی تێلیڤژن دەبن، چونکە ئەمانە لە توانایان دەبێت کە تینوویی خۆیان

بشکینن‌و بە بینینی یاری تۆپی پێ‌و ڤالی بۆڵ‌و گەلێك چەشنەی یاری تر دڵی خۆیان شادو کامەران بکەن.

لەم ساڵانەی دواییدا، کاتێك کە مرۆڤی سەر زەمین سەری هەڵبڕی‌و روی کردە مانگ‌و ئەستێرە گەڕۆکەکان‌و، کەوتە ئیش کردنی نەپساوە بۆ گەیشتنە سەر ئەم جیهانە نە ناسراوانە، تێلێڤژن بە کەلکی هات‌و لە بەجێ هێنانی ئەم ئاواتە کۆنەی مرۆڤایەتیە بەشداری کرد.

هەموو کۆمەڵێ سەر ئەم زەمینە، هەر لەچین‌و ژاپۆن تا ئەو پەڕی ئەوروپا، ئەوەی بە چاو دیت کە چۆن (ئارمسترۆنگ) بۆ یەکەم جار لەمێژووی دوورو درێژی ئادەمیزاددا هێنایە دی، ئایا، ئەگەر تێلێڤژن نەبوایە، دەمان توانی ئەم دیمەنە جوانە بە چاو ببینین؟

کەوابوو تێلێڤژن ڕێگای بڵاوکردنەوەی زانیاری‌و ڕەوشنبیرییە، هۆی کامەرانی‌و شادییە نوێنەری زانایانە لە هەموو جێگایەکدا.

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی ئەو زانایانەی، کە لە دروست کردنی تێلێڤژن بەشداریان کردووە.

## پێرست